# دیوانا

# مەلا عیسا زێباری

مەلا عیسا مشەختی خدر شەهی - زێباری

١٩٣٧- ٢٠٢١

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا<br>مەلا عیسا زێباری |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێکێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین | دیــار عـبـدالله |
| بەرگ | جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-9169-5-8 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٦٧ / ٢١ |





Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

## پێشەکی

ئەڤ دیوانە ئێکە ژ ئەوان دیوانان ئەوێن ل میحرابێن مزگەڤت و تەکیایێن سوفیان هاتیە نڤیسین، کو چەندین هەلبەستێن جیاوازێن ئایینی و سیاسی بخوەڤە دگریت، هەر ئێك ژ ئەوان ڕامانا خوە یا تایبەت ددەت و د ئەڤێ پێشەکییێدا هەوڵ هاتیەدان کو سەرەڕای ژیاننامەیا هەلبەستڤانی ئاماژە ب گرنگترین خالێن گرێدای ب ئەڤێ دیوانێ بهێتە کرن.

**پوختە دیرۆکەك ل سەر ژیاننامەیا هەلبەستڤانی:**

(مەلا عیسا مشەختی خدر)، ل ساڵا (١٩٣٧)ێ، ل گوندێ (شەهێ) سەر ب دەڤەرا زێباریانڤە ژدایکبوویە، ژ بنەماڵەکا ئایینی و جڤاکیێ دەڤەرا زێباریانڤە دهێتە هژمارتن، ناڤبری دوو جاران ژیانا خێزانی پێکهینایە، ل گەل خانمان (زوبیدە عەلی مەحموود و زینە موحەممەد نۆری)، کو خودایێ مەزن پێنج کوڕ (موحەممەد زەکی، فائیز، عەدنان، ناصح و مورشد) و چار کچ (مەیاسە، ڕوقەیە، ئەدیبە، و کەوسەر) ب ئەوان بەخشی. ناڤهاتی ل ڕێککەڤتی (٢٠٢١/٢/٢٧) بۆ هەتا هەتایی ژ ئەڤێ جیهانێ مالئاڤایی کر.

**قۆناغێن فەقیاتیا هەلبەستڤانی:**

(مەلا عیسا) هەر ژ زارۆکینیا خوە هەوڵا بدەستڤەهینانا زانستێن ئیسلامی دایە، دەمێ دگەهیتە ژیێ پێنج ساڵێ دەست ب خواندنا (ئەلیف و بائێ) و قورئانا پیرۆز ل دەڤ (مەلا صالح تێلی) و قوتابیێ ئەوی (فەقی موحەممەد کادانی) دکەت، هەر ل نك ئەوان پەرتووکێن (فتح القریب) یا شەریعەتێ ئیمام شافعی و (تصریف العزی) د زانستێ صەرفا عەرەبیدا خواندن. پاشان بەرەڤ گوندێ (باکرمان) دچیت و دبیتە قوتابیێ (مەلا عەبدولکەریم

ئسپینداری) ناڤدار ب (مەلا عەبدولکەریم باکرمانی) و د بیاڤێ زانستێ نەحو و صەرفا عەرەبیدا مفا ژ ناڤبری وەردگریت.

ل دویڤ ڕەوشت و تیتالێ سەردەمێ کەڤن ئەوا خوەندەکارێن زانستێن ئایینی پەیرەو دکرن کو ژبۆ بدەستڤەهینانا زانستی، ژ ڤی ئالی بۆ ئالیێ دیتر دچوون، کو ب ئەڤێ چەندێ مفا ژ گەلەك زانایێن ئایینی وەردگرتن و ئاستێ خوە پێن زانستی پێشڤە دبرن. مەلا عیسا ژ ئەڤێ پێنگاڤێ بێ باهر نەبوو، بەرەڤ ئاکرێڤە دچیت و بۆ ماوێ دەهـ سالان دبیتە فەقیێ (مەلا سەلیم سەعید ئاکرەیی)، چەندین زانستێن ئایینێ ئیسلامی مینا ڕێزمانا زمانێ عەرەبی، شەریعەت (فقه). پاشان بەرەڤ شەقلاوا سەر ب پارێزگەها هەولێرێڤە دچیت و مفایی ژ زانستێ (مەلا یوسف ئیسماعیل) وەردگریت و دزڤرپیتەڤە ئاکرێ و دووبارە دبیتە فەقیێ مەلا سەلیمێ ناڤبری، پاشی مفایی ژ وانەیێن (مەلا ڕەشیدێ گوران) ل گوندێ (سوسنا) و ل دەڤ (مەلا پیر کادانی) ل گوندێ (باشقال) وەردگریت. هەروەسا مفا ژ وانەیێن (مەلا سابرِ)ی ژی وەرگرتیە و پەرتووکێن (ریاض الصالحین) د زانستێن فەرموودەیێن پێغەمبەریدا (س)، (البلاغة الواضحة) د زانستێ ڕەوانبێژییێدا، (الرجیه) د زانستێ میراتیدا و چەندین پەرتووکێن دیتر ل دەڤ ئەوی خواندینە.

**قۆناغێن مەلاتیا هەلبەستڤانی:**

ل سالا (١٩٧٠)ێ، پشکداری د ئەزموونان‌دا ل هەولێرێ دکەت و دبیتە خودانێ باوەرنامەیا پەیمانگەها ئیسلامی، ب ئەڤێ چەندێ ل سەر میلاکێ ئەوقافا پارێزگەها مویسل وەك پێشنڤێژ دهێتە دەستنیشانکرن و پاشان ل باژێرێ بەغداد ئەزموونێن گۆتارخوینیێ ددەت و قەبویل دبیت، ل گەلەك مزگەڤتێن باژێرێ مویسل دبیتە پێشنڤێژ و گۆتارخوین کو پتر ژ بیست

مزگەڤتان مینا: مزگەڤتا (ئامینە خاتون) ئەوا دکەڤیتە سویکا زێڕینگران د ناڤ بازێڕێ مویسلێدا و بۆ دەمێ حەفت سالان واتە هەتا سالا (١٩٧٨)ێ، ل وێرێ دمینیت و پاشان ژبۆ مزگەڤتێن (نینوى الشرقية)، (الجريس)، (العباس)، (حسان البكري) و (عبدالغني) ل شەقامێ نەجەفی، (الانصار) ل تاخێ کەڕامە و ل دویماهیێ ل مزگەڤتا (الصادقين) ل گەڕەکا ئەلبەکر. سەرەڕای ئەڤان مزگەڤتان ل دەرڤەی مویسل ژی ل ناڤچەیێن زۆمار و حەمام ئەلعەلیل و... هتد، مەلاتی کریە.

مەلا عیسا ل سالا (٢٠٠٦)ێ، ل گەل خێزانا خوە ژ مویسل بەرەڤ بازێرۆکێ دینارتێ یا سەر ب دەڤەرداریا ئاکرێڤە دچیت، و ل ویرێ ئاکنجی دبیت و ب ئەرکێ پێشنڤێژیا مزگەڤتا مەزنا دینارتێ ڕادبیت. هەژی گوتنێە ژ ئەوێ سەربوڕا مەلا عیسایی د زانستێن ئایینی دا هەین، هژمارەکا زێدە یا خوەندەکارێن ئایینی مفا ژ وانەیێن ئەوی وەرگرتینە و ناڤبری کێماسی د بەلاڤکرنا زانستێدا نەکریە.

**چەند تێبینیەك ل سەر دیوانێ:**

ئەڤ دیوانە چەندین خالان ب خوەڤە دگریت، گرنگترینی ئەوان ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێنە:

- ئەڤ دیوانە ژ دوو پشکان پێکهاتیە: پشکا ئێکێ: هەلبەستێن ب زمانی کوردی و پشکا دوویێ: هەلبەستێن ب زمانی عەرەبی، هەر ئێك ژ ئەڤان پشکان خوەدی چەندین هەلبەستن، لێ هژمارا هەلبەستێن کوردی گەلەك زێدەترن.

- ئەڤ دیوانە ژ (٢٦) هەلبەستێن ئایینی و سیاسی پێکهاتیە، لێ هەژمارا هەلبەستێن ئایینی زێدەترن. سەرەڕای هەلبەستێن کوردی چەند هۆزانەك ب زمانی عەرەبی ژی کو ئەو ژی ژ (٦) هەلبەستان پێکهاتینە.

- هەلبەستڤانی، ناڤێ خوە وەك ناسناڤ بکارهینایە و د گەلەك هەلبەستێن خوەدا ب دەهان جاران ناڤێ (عیسا) دووبارە کریە بۆ نموونە وەك ئەڤان مالکان:

عیســـای شـــعرا خـــۆ ڤـــەهینـــا
وی هـەر قـەسـەك ل جیـەکـی هینـا
عـــەجـــەلـــە کـــر وەکـــی دینـــا
دا بیتـــە نـــاڤ ســـاحا مـــەزن

- هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ وەك گەلەك هەلبەستڤانێن دیتر ب پەیدابوونا ڕویدانەکا گرنگ دبیتە پالدەرەك بۆ نڤیسینا هەلبەستان، لەوڕا (مەلا عیسا) ژی ژ ئەڤێ چەندێ یێ بێ بەهر نینە، ب درێژاهیا ژینێ خوە سەرەڕای شیانێن نڤیسینا هەلبەستان، لێ هەلبەست نەڤەهاندینە هەتا ژناڤچوونا ڕژیما بەعسا ل سالا (٢٠٠٣)ێ، دبیتە پالدەرەکێ سەرەکی بۆ ڤەهاندنا هۆزانان و ئێکەم هەلبەستا (مەلا عیسا)ی بۆ ڕێککەڤتی (٢٠٠٣/٧/٢٠)ێ، ل ژێر ناڤونیشانێ (عیسا گەلەك خۆ غافل کر) کو هۆزانڤان خوە وەك کەسەك گونەهکار ددەتە نیاسین و بۆ نموونە وەها دبێژیت:

عیســـای گـــەلـــەك خـــۆ غافـــل کـــر
ئـــەوی خـــۆ ل ئـــاخرەتـــێ ســـل کـــر
وی کـــەیفـــا مـــەلعـــوونی خـــۆش کـــر
لـــەوا مـــەجنـــوون و حـــەیرانـــە

- تەڤایا هەلبەستێن (مەلا عیسا)ی دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٣-٢٠٠٦)ێ، هاتینە ڤەهاندن، ب تنێ ئێك هۆزان نەبیت كو ئەو ژی ل سالا (٢٠١٥)ێ، پشتی پەیدابوونا دەستەكا (داعش) ل سالا (٢٠١٤)ێ، ل ژێر ناڤونیشانێ (گازیەك بۆ داعش) نڤیسیە.

- هندەك هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ بێ ناڤونیشان بوون، لێ مە هەولدا ناڤەكێ گونجای ژ هەلبەستێ هەلبژێرین و دەستنیشان بكەین، بۆ نموونە وەك هەلبەستا: (عیسای گەلەك خۆ غافل كر، هلۆ عیسا خۆ هشیاركە و... هتد).

- ب هیچ ڕەنگەكی مە دەستكاریا ڕێنڤیسا هۆزانڤانی نەكریە، ب تنێ د ئەوان پەیڤاندا كو ب شاشیا ڕێنڤیسی دهێنە هژمارتن و كارتێكرنێ ل ڕیتم و واتایا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتیێ ئەوێ ناكەت، ڕاستڤەكرن هاتینە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چو- چوو)، (بو- بوو)، (بو- بۆ) و... هتد.

- هەوڵ هاتیەدان هەر پەیڤەكا نە ڕۆهن یان پەیڤێن پێدڤی ب پێناسەكرنێ د دیوانێدا، ب شێوەیەكێ ڕێكوپێك ل پەراوێزێ هاتینە نڤیسین.

- شێوازێ نڤیسینا ئەڤێ دیوانێ ب دەڤۆكا دەڤەرا (زێباریان)ە، هەر كەسێ ب هویرێ ئەڤێ دیوانێ بخوینیت ئەڤ چەندە دێ بۆ ئەوی دیار بیت.

- هەر خواندەڤانەكێ ب باشی ئەڤێ دیوانێ بخوینیت، دێ ب دەهان پەیڤێن عەربی بینیت، ئەڤ چەندە ژی بۆ كارتێكرنا ئایینی ل سەر هەلبەستڤانی دزڤریت. ل ڤێرێ ب تنێ دێ ئاماژە ب چەند پەیڤان كەین مینا: طعام (خوارن)، طەریق (ڕێك)، موطیع (گوهدار)، حفظ (پاراستن)، طاهر (پاقژ)، خشوع (خوەشكاندن)، حضووڕ (ئامادەبوون)، منشورات (بەلاڤۆك)، و... هتد.

- ئەڤ دیوانە وەك گەلەك دیوانێن كلاسیكێن دیتر هژمارەكا زێدە یا پەیڤێن كوردی ب دارشتنا عەرەبی هاتینە نڤیسین وەك: پنط پنط (پنت پنت یان پت پت)، صەد (سەد)، وەصا (وەسا)، طۆپ (توپ)، و... هتد.

ل داویێ سوپاسیا چێكەرێ ئەرد و ئەسمانان دكەین كو شیان داینە مە، ئەم ئەڤێ دیوانێ ب داوی بینین و هەروەسا سوپاسیا بەرێزان (مەلا ناصح كوڕێ هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ و (مەلا عەبدولخالق عەلی زێباری) كو بەردەوام هاریكار و پشتەڤانێن مە بوون، هیڤیخوازین ئەڤ كارە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنا گشت هەلبەست دۆستان.

د. فاخر حەسەن گولی

دهۆك ٢٠٢١

## عیسای گەلەك خۆ غافل كر[١]

عیسای گەلەك خۆ غافل كر
ئەوی خۆ ل ئاخرەتێ سل كر
وی كەیفا مەلعوونی خۆش كر
لەوا مەجنوون[٢] و حەیرانە

لەوا ئەو مەجنوون و دینە
ئەوی ئاگەهـ ل خۆ نینە
ئەوی گۆت بەس نڤێژ دینە
لەوا مەفتوونێ[٣] شەیطانە

وی ئەمرێ[٤] ب معرووفی نەكر
نەهیا مونكەری[٥] تەرك كر
عەذابا قەبری وی ل بیر كر
ماشائەڵلا چەندێ نەزانە

ماشائەڵلا چەندێ مەغرووره[٦]

---

[١] ئەڤ هۆزانە ل رێككەڤتی (٢٠٠٣/٧/٢٠)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن، وەك ئێكەمین هۆزانا هەلبەستڤانی دهێتە هژمارتن.

[٢] دین، شێت.

[٣] سەربووركری، شێت، دین.

[٤] فەرمان.

[٥] نەباشی، نە دروستی.

[٦] دفنبلند.

گوهدارێ شەیطانێ کوورە
ئەوی گۆت ڕەبێ غەفوورە[١]
بۆ هەمی جین[٢] و ئینسانە

ئەوی گۆت ڕەببێ تەووابە
نە گۆت کانێ دای و بابە
هەموو کەفتنە بن تۆڕابە[٣]
طەعامێت[٤] مشك و مارانە

عیسای مرن ل خۆ دویر کر
حوکمەتێ ئەو تقاعد[٥] کر
وی وظیفە[٦] تەرك نەکر
چوو نك صەدیق و واسطانە[٧]

مەئمور[٨] نفوس موتتەهەم[٩] کر
موختارێ خۆ دروهین[١٠] کر

---

[١] غەفوور: ئەوێ ل گونەهکاری دبووریت و گونەهێن ئەوی ژێ دبەت؛ ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە.

[٢] ئەجنە.

[٣] ئاخ.

[٤] خوارن.

[٥] خانەنشین.

[٦] ئەرك.

[٧] واستە، ناڤبژیڤانی.

[٨] کارفەما.

[٩] گونەهبار، ناوانبار.

[١٠] درەو.

ئەوی عومرێ خۆ بچیك كر
ئەڤە نە شولا عاقلانە

وی گۆت ئەز پێنجی كێمترم
سەیدایێ ئەكرەم[١] كچكەترم
وی گۆت ئەز زیكا نامرم
دێ بمە نوحێ زەمانە

بەلێ وی كەیفە ئەڤرۆكە
خەزینا ڕەحمەتێ كۆكە[٢]
بۆ سەر مولكێ هەما جۆكە
دێ ئاڤەدەت هەموو زەڤیانە

فەیا ڕەبەلعالەمینە[٣]
بۆ عیسای تۆ بغەفرینە[٤]
ژ غەیری[٥] تە وی كەس نینە
بۆ ڕۆژا حەشر[٦] و میزانە

---

[١] مەلا ئەكرەم سەعدی، خەلكێ دەڤەرا گۆران بوو، ئێك ژ مەزنە زانایێن كورد ل مویسل بوو، ئەندامێ لیژنا فەتوا یا ئێكەتیا زانایێن ئایینێ ئیسلامێ كوردستانێ – لقا مویسل بوو. ل سالا (٢٠٠٦)ی پشتی ب بحهەینانا نڤێژا مەغرەب ل بەر دەرگەهێ مزگەڤتا (مەلا سەعید) ل ناڤ بازێڕێ مویسل هاتە تیروركرن و گیان خوە ژ دەستدا.

[٢] سەروەبەرە، ڕێكوپێكە.

[٣] خودایێ جیهانیان.

[٤] مەبەست گونەهێن وی پێ بهێلە.

[٥] ژبلی.

[٦] قیامەتێ.

خۆدا ئەو مسکین و ژارە
گونەح[1] زۆر و شەرمەزارە
شەڤ و ڕۆژ هەوار هەوارە
ژ ترسا ڕەبێ دەییانە[2]

ژ ترسا وی چ حال نینە
دل و مێلاك لێت سوتینە
هەوارە بۆ بغەفرینە
شەفیعێ[3] وی بیت قورئانە

عەقیدا[4] خۆ بسلمانە
ڕەصیدێ[5] وی بەس قورئانە
طەریقا[6] وی یا صوفیانە[7]
هەوارا وی یێ ڕەحمانە

هیڤیا من ل خالقێ مەزن
پێلیت[8] چاڤ و زمانێ من
هەم پێلیت بۆ من عاقلێ من
دا بخوینم ویرد[1] و قورئانە

---

(١) گونەهـ.

(٢) دەیان، ژ ناڤێن خودایێ مەزنە کو ئەوێ زۆرداران دشکێنیت.

(٣) بەرڤان.

(٤) بیر و باوەری.

(٥) دراڤ دانایی یان یێ هەلگرتی.

(٦) ڕێباز، ڕێك.

(٧) سوفیگەری.

(٨) بهێلیت.

هـەم پێلیـت حێـل[٢] و قـووەتـێ
دا بشـێم بچـم بـۆ مزگـەڤتـێ
دا حاضـر بـم ل جـەماعـەتـێ[٣]
دگـەل ئیمـام و مـەئمومیانـە[٤]

عیسـا پیچـەك هـزرا خـۆ بكـە
تۆ مـەحكەمـێ ب نەفسا خۆ بكە
ئـەوا پیسـە موتـەهـەم[٥] كـە
ئـەو سـەبـەبـێ گونـەحانـە[٦]

یـا ڕەببـێ دویمـای[٧] خێـر بیـت
كـەلیما شـەهادێ[٨] ئـەخیـر[٩] بیت
دائیمـەن[١٠] مـن خـودێ ل بیـر بیـت
نـەبـم مـەفتـوون و حـەیرانـە

ل سـەكـەراتـێ مـن هایـل[١] خۆ بیت

---

[١] تەسبیحات.

[٢] هێز، شیان.

[٣] مەبەست نڤێژا ب جەماعەت (پێگڤە) ل مزگەڤتێ.

[٤] نڤێژكەران.

[٥] گونەهبار، تاوانبار.

[٦] گونەهانە.

[٧] دویماهی.

[٨] اشهد أن لااله الا الله وأن محمدا رسول الله.

[٩] دویماهی، داوی.

[١٠] بەردەوام، هەردەم.

مـەلعـوونێ پـیس ل مـن دویـر بیـت
دەسـتێ منـدا ئـەو ئێخسـیر بیـت
ب ڕەڤیـت بکـەڤیتـە کولانـە

هـزار صـەڵات و هـەم سـەلام
بـۆ ڕوحـا نـەبیـێ خـاص و عـام[٢]
موحـەمـەدێ شـیرین کـەلام[٣]
ڕەحمـە بـۆ جـین و ئینسـانە[٤]



---

[١] هایدار، ئاگەهـ.

[٢] تایبەت و گشتی.

[٣] ئاخفتن.

[٤] ئەجنە مرۆڤ.

## هلۆ عیسا خۆ هشیارکە[1]

هلۆ عیسا خۆ هشیارکە
درەنگە هندە هێڤارە[2]
وەختێ مرنا تە نێزیك بوو
ل حالێ خۆ بکە چارە

چاڤ و گوچك[3] ل تە ضەعیف بوون
تە عەقل و فام[4] لێ وندا بوون
گەلەك عیللەت[5] ل تە پەیدا بوون
تۆ دێ هەر چی نینە چارە

تۆ دێ ڤێ دونیایێ هێلی
دێ کەی قەستا قەبر و کێلی
دێ زۆریەتێ[6] ل پاش خۆ هێلی
دێ تە داننە سەر دوو دارە[1]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەفتی (٢٠٠٣/١٠/٣١)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن. هەژی گۆتنێیە هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ، ئەڤ هەلبەستە د سالێن شێستیا ژیێ خوەدا ب مەرەما هشیارکرنا نەفسا خوە و کەسانێن وەك خوە نڤیساندیە. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ)).

[2] ئێڤارە.

[3] گوه.

[4] تێگەهشتن.

[5] ئێش و ژان.

[6] دویندەه.

دێ تە سیار کەن و بەزینن
بۆ موقبەرێ[٢] تە گەهینن
مشك و مارا ل تە جەمینن
تە نینە بانگ و هەوارە

دێ تە داهێلنە قەبرێ کویر
ل حالێ خۆ بکە تەکبیر
خۆ بپارێزە ل لەعینێ[٣] پیر
پیرە صەیە ئەو نەیارە

پیرە صەیە یێ ل دی[٤] تە تێ
وی ئادەم دەرکر ل جەننەتێ
هندی ببینیت دەرفەتێ
وی نینە عەهد و قەرارە

عیسا هوشیار بە و بزانە
دونیا مولکێ غافلانە
قەصرێت غەریبی لێ نەدانە
بێ فایدەیە یا مارە

تۆ مێڤانی د دونیایێدا
گەلەك تۆ نامینی تێدا
خرڤە نەکە مالی تێدا
دێ هێلی بۆ خزم و یارە

---

(١) داربەست.

(٢) گورستان.

(٣) شەیتان.

(٤) دویڤ.

بــۆ تــه ناكــه‌ن صــده‌قــه و خێـــرا
هـــــه‌م دوعـــــا و د دی(1) نڤێژێـــــرا
دێ تـــه بیـــر كـــه‌ن دبـــن ئـــاخێرا
ڕه‌حـــــم نـــــه‌مایـــــه ئێكجـــــاره

تـــۆ ل دونیـــایێ خـــۆ زاهـــد(2) كـــه
تـــۆ جهـــێ خـــۆ ل مزگـــه‌ڤتـــێ چێبكـــه
قورئـــانێ بخوینـــه و فكـــرێ(3) بكـــه
بكـــــه گـــــری و بكـــــه هـــــه‌واره

بكـــــه گـــــری و بكـــــه هـــــه‌وار
وه‌كـــــی چـــــاك و صـــــوفیێت زێبـــــار(4)
تـــۆ شـــه‌یطـــانی ل خـــۆ بكـــه نـــه‌یـــار
بزانـــــه دونیـــــا پیســـــه واره

بكـــه تـــه‌وبـــه ل گوناحێـــت(5) خـــۆ
موطیـــع(6) بـــه ب ئـــه‌مـــرێ ڕه‌بـــێ خـــۆ
ل خـــۆ ڕازی بكـــه مرۆڤێـــت خـــۆ
هـــه‌مـــوو دۆســـت و هـــه‌مـــوو یـــاره

---

(1) دویڤ.

(2) خوه پاراستن، دویركه‌ڤتن.

(3) هزر و بیر.

(4) ده‌ڤه‌را زیبێاریان و دشێن بێژین ته‌ڤایا ده‌ڤه‌رێن گرێدای ب ئاكرێڤه پڕن ژ په‌یڕه‌وێن ڕێبازا سوفیگه‌ریێ.

(5) گوناهێت.

(6) گوهدار.

حقدێ[1] ل دلێ خۆ دەربێخە
تۆ شەیطانی ل خۆ دویر بێخە
ئەوێ وی بکەت ئەوێ زیخە[2]
ل ناڤ دۆست و هەموو یارە

دەستا بەردە ل دونیایێ
ئەوا پیسە ب کێر تە ناهێ
ل حالێ خۆ بکە ڕایێ[3]
وەڵلا ئەو نەخۆش وارە

عیسا غەیبەت یا چەوانە
خوارنا گۆشتێ مرۆڤانە
پشتی دەرکەفت ڕوحا وانە
ئەو گۆتنا ڕەبێ جەببارە[4]

وێجا تۆ غەیبەتێ بەس کە
چاڤ و گوچکێت[5] خۆش حفظ[6] کە
تۆ شەرمێ ل قورئانا خۆ بکە
ئەو بۆ تە ئەکبەر[7] ئینذارە[8]

(1) نەڤیان، کین.
(2) زیرەك و چەلەنگ.
(3) پرسیار.
(4) ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە.
(5) گوه.
(6) پاراستن.
(7) مەزن.
(8) هۆشداری، ئاگەهداری.

بلا بەس بیت بخۆ بگری
عومرێ تە ل شێستێ رابری
خۆ بپارێزە ل ئاگری
جهێ موجرم[1] و کوففارە[2]

گەنمێ زەر بووی رِپنێ ناکەت
دارا هشک بەلگا نادەت
دختور پیرا جحێل ناکەت
مرن هاتوو ببە هوشیارە

بەسە عیسا خۆ حاضر کە
صەفحەکا[3] نوی بخۆ چێبکە
صولحا[4] درست دگەل خودێ بکە
هەمووت[5] زانن ئەو غەففارە[6]

فەیا رەحمان[7] و یا سەمیع[8]
گۆنەحکارم[9] و یا بەدیع[1]

---

(1) گونەهکار، ناوانبار.

(2) کافران.

(3) بەرپەڕ، لاپەڕ.

(4) ئاشتی.

(5) د.

(6) غەففار: ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و رامانا (باشترین لێبوولەر) ددەت.

(7) رەحمان: ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و رامانا (مێهرەبان) ددەت.

(8) سەمیع: ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و رامانا (گوهلێکەر) ددەت.

(9) گۆنەهکارم.

موحــەمــەدی ل مــن بکــە شــەفیــع[٢] ئـــەو شـــەفیعـــێ گونـــەحکـــارە

هـــزار صـــەلات و هـــەم ســـەلام
بـــۆ ڕوحـــا نـــەبیـــێ خـــاص و عـــام

موحـــەمـــەدێ شـــیرین کـــەلام[٣] مـــەحبـــووبێ[٤] جـــین و ئینســـانە



---

(١) بەدیع: ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا (ئەفراندەر) ددەت.

(٢) شەفیع: ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا (بەرەڤانکەر) ددەت.

(٣) ئاخفتن.

(٤) خوەشتڤی.

## حەژێکرنا پێغەمبەری (س)[١]

بنـــاڤێ خـــودێ مـــن دەســـتپێکر
قصـيدا[٢] خـۆ مـن تـەرتيـب[٣] کـر
مـن قـەصـدا[٤] يێـل[٥] مـەدينـێ کـر
کـــو خاتـــەمـــێ[٦] ئـــەنبيانـــە[٧]

بـــرا مـــا هنـــدی ئـــەز بێـــژم
ڕاســـتا وی يـــێ کـــەڕ و گێـــژم
هنـــدی ئـــەز حـــوبری بڕێـــژم
ناگـــەهمـــە مـــەدح و وەصـــفانە[٨]

يێـل مـــەدينـــێ مـــەعشـــووقێ مـــن
ئـــەوی صـــوتن مێلاکێـــت مـــن
ئـــەو شـــەفيعـــێ گونـــەحێـــت[٩] مـــن
ل ڕۆژا حـــــەشـــــر و ميزانـــــە

[١] ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی (٢٠/١/٢٠٠٤)ێ، ل باژێڕێ (مويسل) هاتيە ڤەهاندن.
[٢] سروود.
[٣] ڕێکخستن، ڕێکوپێککرن.
[٤] بەرەڤ.
[٥] يێ ل.
[٦] دويماهی، داوی.
[٧] پێغەمبەران.
[٨] سالوخەت.
[٩] گونەهێت.

عیسـا[١] بـەسـە تـۆ ئـەو نینـی
ل عـــەشـــقا وی درەوینـــی
تـۆ بـەس ئاخفتنـا ت[٢] جـەمینـی
ئـــەڤـــە شـــولا شـــاعێرانە

ئـەگـەر تـە موحیبـەت[٣] هـەبیـت
طاعـەت[٤] دێ ل نـك تـە زێـدە بیـت
ترسـا خـودێ دێ تـە هـەبیـت
ئـەڤـە شـەئنـێ[٥] صـادقانە[٦]

عیسـا بـەسـە تـۆ شـاعێر نـی[٧]
تـۆ ل ئاخفتنـا یـێ مـاهر[٨] نـی
تۆ ل گونـەحـا[٩] یـێ طـاهر[١٠] نـی
نـەهـێ نـاڤ سـاح[١١] و مـەیدانـە[١]

(١) هەلبەستڤان باسێ خوە دکەت.
(٢) د.
(٣) حەژێکرن.
(٤) گوهداری.
(٥) کاروبار.
(٦) ڕاستبێژان، ڕاستگویان.
(٧) نینی.
(٨) شەهرەزا.
(٩) گونەه.
(١٠) پاك، پاقژ.
(١١) گۆڕەپان، مەیدان.

قـەسـێت تـە مـومیژت[٢] نپـاخێ[٣]
ئێـك بـۆ خـارنێ دەهـ بـۆ ئـاخێ
تـۆ ل عـەقلـێ خـۆ یـێ نـەسـاخێ
شـــیعر شـــولا عاقلانـــــە

عاشـق ئـەوە یـێ كـو وە بیـت
چـاڤ ل ڕۆنـدكا هشـك نـەبیـت
ئــەوێ خــارن و خــەو نــەبیـت
ل ترســـا ڕەبـــێ دەیانـــە

یێـل نـك نـەبیـت حوببـا نـەبـی[٤]
دینـــێ وی یــێ كامـــل نــابی
طاعــەتــێ وی قــەبــوول نــابی
چنكـــی ضـــەعیفـــە ل ئیمانـــە

ئیمـانێ یێـت هـەی شـەڕطـێت[٥] خـۆ
لازمـــە بڤێـــتن نـــەبیــێ خـــۆ
پـتــر ژ نــەفــس و عــەیـالێ خـۆ
حـــەتـــا ببیـــت بســـلمانە

---

[١] ئەڤە بۆ خوەشكاندنا هەلبەستڤانی دزڤریت، كو دڤێت بێژیت ئەز نەهاتیمە ڕێزا هەلبەستڤانا.
[٢] مێویژ.
[٣] (نپاخ) گوندەكە سەر ب هۆزا زێباریانڤەیە. مێویژێت گوندی ناڤبری نە گەلەك باش و بێ سەرۆبەرن.
[٤] حەژێكرنا پێغەمبەری (س).
[٥] مەرجێت.

برا ما موحیبەت[١] چیە
ئەو ئیطاعا[٢] ئیلاهیە
نە ئاخفتنەکا ب دەڤیە
عەمەل[٣] عەمەلێ شەیطانە

موحیب[٤] ئەوە یێ کو وەبیت
ل ڤیانێ وەکو (ثەوبانی)[٥] بیت
ڕەنگ و صورەت لێ زەر ببیت
ل دویرکەفتنا مەعشووقانە

دویر بیت ل ڕیا[٦] و مەصلەحەتێ
بڤێتن نەبیێ ئوممەتێ
بەس بو نەفعێ[٧] قیامەتێ
ئەڤە مەعلووم و بەیانە[٨]

ببیت تابع[٩] بۆ گۆتنێت وی
خۆ دویر بێخیت ل نەهیێت[١٠] وی

---

[١] حەژێکرن.

[٢] گوهداری.

[٣] کار.

[٤] حەژێکەر.

[٥] ناڤێ هەڤالەکێ پێغەمبەریە (س)، کو گەلەك حەز ژ پێغەمبەری دکر.

[٦] ریمەتی.

[٧] بەرژەوەندی.

[٨] ئاشکرا.

[٩] پەیرەو.

[١٠] ئەو فەرمانێن گوتی خوە ژێ دویر بێخە.

ببیت موطیع[1] بۆ ڕەبێ وی
گەلەك بخوینیت قورئانە

گەلەك ویرد[2] و نڤێژ هەبن
دل و زمان غافل نەبن
گەلەك ب خشوع وخضوع[3] بن
دگەل مرۆڤێت بسلمانە

بێ عەدەت بدە صەلەواتا
حاضر ببیت ل جەماعاتا
دل فرەهـ بیت ل صەدەقاتا
دگەل فەقیر و هەژارانە

عیسا ل ڤان هەمیا یێ دویرە
بەلێ غەریب و ئێخسیرە
ڕەبی تۆ لێ بکە تەکبیرە
ئەو سائیلێ[4] ل بەر دەرگەهانە

سائیلێ ل بەر دەرگێ تەیە
زۆر موحتاجێ عەفوا تەیە
ل ئاخڤتنا خۆ یێ بستەیە
چنکی ناڤێ تە ڕەحمانە

---

(1) گوهدار.

(2) تەسبیحات.

(3) خوە شکاندن، خوە چەماندن.

(4) خوازۆك.

## مه ئیتیحادا خۆ ڤەکر[1]

بنـــاڤێ خـــودێ مـــه دەســـــتپێکر
مـــه ئیتیحـــادا[2] خـــۆ ڤـــەکـــر
مـه ل سـەر خـودێ تـەوەککـول[3] کـر
پشـــــتەڤـــانێ مـــه هـــەمیانـــــه

مـــه ڤـــەکـــر ئیتیحـــادا خـــۆ
وەکــــی دهـــۆك و هـــەم زاخـــۆ
ئـــەم گـــەهشـــتینه مـــرادا خـــۆ
هـــەدەفـــا مـــه هـــەر قورئانـــــه

مـه فـەرعـەك[4] ڤـەکربـوو ل میسـل
خـەلکـێ ڕازی بیـت ئـان یـێ سـل
ئـــەم بووینـــه هـــەمـــزەتولـــوەصـــل
ل بـــەینـــا کـــورد و عـــەرەبانـــه

وەختـــێ مـــه ئیتحـــاد ڤـــەکـــر
حـــەســـوودا خـــۆ ل مـــه دویـــر کـــر
بـــێ جورعـــەتـــا حضـــوور[5] نـــەکـــر
وا وەر بـــوو حـــوکمێ بـــەعثیانـــه[1]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٣/٦/١٦)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[2] ئێکەتی.

[3] پشتبەستن.

[4] لقەك.

[5] ئامادەبوون، بەرهەڤبوون.

هنــدەكــا گــۆت ئــەڤــە حیزبینــە
موتــەعــەصــبن[٢] ئــەو قــەومینــە
نــە خــەمخــۆرێن ڤــی دینینــە
هــــەدەفــــا وان نــــە قورئانــــە

هــەدەفــا مــە یــا مــەعلوومــە
مللــەتــێ كــورد یــێ مــەظــلوومە[٣]
زمــانێ كــوردی مــەعدوومــە[٤]
نــــزانن مــــەعنــــا قورئانــــە

بــرا بزانــە كــا ئــەم كینــە[٥]
ئــەم پێــنج ل هــەشــتا زێبارینــە[٦]
فیــدائیێت ئــەڤــی دینــی نــە
نــەبــن گوهــدارێت شــەیطانــە

رەئیســــێ[٧] مــــە بریفكیــــە
ئــەو مــەشــهووره ب میرســیدیە[١]

---

[١] پارتا بەعس.

[٢] دەمارگیر.

[٣] ستەمبار.

[٤] رامانا ئەوێ ئەوە كو ل (مویسل) ل سەردەمێ بەعسیان خواندن و نڤیسین ب زمانێ كوردی بەربەند بوو.

[٥] ئەندامێن ئێكەتیا زانایان ـ لقا مویسل.

[٦] ئەو پێنح پێكهاتیبوون ژ: (مەلا عیسا شەهی زێباری، مەلا زاهر بانی زێباری، مەلا ئیبراهیم گورگەڤەیی زێباری، مەلا خالد چاربوتی زێباری و مەلا عەبدولخالق بانی زێباری).

[٧] سەرۆكێ لقا مویسل یا ئێكەتیا زانایان.

ب عەقل و عیلما قصووری[٢] نیە
ئەو فارسێ[٣] مەیدانانە
ڕەئیسێ عام عقراویە[٤]
مەلا زادە و تێگەهشتیە
ئەڤەش[٥] فەضلا[٦] ئیلاهیە
بنەمالا عالمانە

گەلۆ پا موئەسس[٧] کی بوو
ئەو زەعیمێ[٨] بارزانی بوو[٩]
بەڕەڤانێ فەقیری بوو
ل سەر ئاخا کوردستانە

ئەو بۆ خودانێ خەنجەرێ
خائین ل جهێ مە کرنە دەرێ
هەموو مرن ب وێ کەسەرێ
نەگەهشتنە چ مرادانە

---

(١) شێخ موحەمەد مێرسیدی.

(٢) کێماسی.

(٣) مێرحواس، عەگید و چەلەنگ.

(٤) ئەوی دەمی (مەلا مەحەمەد ئاکرەیی) سەرۆکێ مەکتەبا تەنفیزی یا ئێکەتیا زانایان بوو.

(٥) ئەڤە ژ.

(٦) باشی، قەنجی.

(٧) دامەزرێنەر.

(٨) سەرکردە.

(٩) ل سالا (١٩٧١)ێ، ئێکەتیا زانان ل سەر دەستێ (مەلا مستەفا بارزانی) هاتبوو دامەزراندن.

برا وی گۆت ب ئیزنا[1] خودێ
ئەز دێ دانم ئێتحادێ
دا مەلا بگەهنە مرادێ
سەربلندیا مە هەمیانە

برا ما ئیتیحاد چیە
ئەو مەنفەتێ[2] دینیە
یا ل چەند مەلا چێکریە
ل مابەینا چەند عالمانە

ئەندامێت وێ هەموو مێرن
ل حەرەکەتا[3] وەکی شێرن
حەقیێ ئەبەد[4] ناڤەشێرن
ئەڤە شەئنێ بسلمانە

ل عەقیدا[5] خۆ ئەم صوفینە
ل مەذهەبێ خۆ شافعینە
بۆ دینێ خۆ فیدائینە
موعینێ[6] مە بیت ڕەحمانە

وەختێ مە ئیتیحاد ڤەکر

---

(١) دەستویر، فەرمان.
(٢) مەنفیەعەت، بەرژەوەندی.
(٣) لڤین.
(٤) هەتا هەتا.
(٥) بیر و باوەری.
(٦) هاریکاردەر.

مە حەفلەكا[١] زۆر موهیم كر
عالەم مە پێ تەعەجووب كر
پێ كەیفخۆش بوون بسلمانە

عەریف حەفلە[٢] كوڕێ[٣] من بوو
ڕەوشا حەفلێ پێ زێدە بوو
سەرێ من چەند پێ بلندبوو
ل ناڤ وان كورد و عەرەبانە

برا ئیتیحاد ئەڤەیە
ئاخڤتن هەمی یا زێدەیە
ڕەئیسێ[٤] وێ شێخێ مە
خودانێ كوچك و مێڤانە

نائیبێ[٥] وێ ئیبراهیمە[٦]
ماشائەڵلا چەندێ فەهیمە[٧]
زمان خۆش و چەند حەلیمە[٨]
ئەو مێرێ ل ناڤ دیوانانە

یێ دگەل مە دا عەبدولخالق[١]

---

[١] ئاهەنگ.

[٢] ئەوێ بەرنامەیێ ئاهەنگێ پێشكێش دكەت.

[٣] مەلا ناصح كوڕێ مەلا عیسای هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ، ل ساڵا (١٩٧٣)ێ هاتیە ل سەر دونیایێ، نوكە پێشنڤێژ و گۆتارخوینە ل باژێرێ ئاكرێ.

[٤] سەرۆك.

[٥] جێگر.

[٦] مەلا ئیبراهیم ئاكرەیی.

[٧] تێگەهشتیە.

[٨] نەرم.

ل ناڤ مەجلسا[٢] ئەوە ناطق[٣]
يێ کچکە بوو هێژ موراهق[٤]
عەقلێ وی عەقلێ مەزنانە

ئەندام کینە سێ موفتینە
دژ موصلحێت[٥] مللەتینە
یێت دیش[٦] واعظێت[٧] گشتینە
موطیعێت[٨] ڕەبێ ڕەحمانە

عیسای[٩] گەلەك خۆ شەرمین کر
ئەوی خۆ ل ڕێزێ تەئخیر[١٠] کر
ئەوا ت[١١] زانیش[١٢] ئەوی ل بیر کر
شەرم نە شەئنێ مێرانە

د سالا دوو هزار و سێ دا

---

[١] مەلا عەبدولخالق عەلی بانی زیباری.

[٢] جڤات.

[٣] ئاخڤتن.

[٤] پێگەهشتی.

[٥] چاککار، باشککار.

[٦] ژی.

[٧] بانگخواز.

[٨] گوهدارێت.

[٩] مەلا عیسا مشەختی، هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ.

[١٠] پاشئێخستن.

[١١] د.

[١٢] ئەوا د زانین ژی.

ل شـــازدەیـــێ هـــەیڤـــا شـــەشـــێ دا
ئیتیحـــــاد ڤـــــەبـــوو د میســـــلێ دا
خـــــودێ ناصـــــرێ[1] هـــــەمیانـــــە
صـــــەلات و ســـــەلام بـــــێ عـــــەدەد[2]
ل ســـەر مورسـەلـێ[3] ڕەبـێ صـەمـەد[4]
نـــاڤێ وی ل عـــەســـمانا ئـــەحمـــەد
ئـــــەو شـــــەفیعـــــێ موذنبانـــــە[5]

---

[1] پشتەڤان.

[2] بێ هژمارە.

[3] ڕەسول واتە هنارتی مەبەست پێغەمبەرێ ئیسلامێ یە (س).

[4] صەمەد: ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا (ئەوێ خەلك دچیتە دەڤ ژ بۆ بجهھینانا پێدڤیان) ددەت.

[5] گونەهکاران.

## هزار حەمد و شوکر بۆ خالقی[1]

هزار حەمد و هزار شوکر
بۆ خالقێ (حەی)[2] یێ نەمر
قەدرێ عولەما بلند کر
بوون وارثێت[3] ئەنبیانە[4]

د قورئانێ دا زکر کرن
دگەل مەلەکا[5] بەرامبەر کرن
ل دونیایێ سەر بلند کرن
حەتا دویماهیا زەمانە

حەمد و ثەنایێت بێ عەدەد[6]
بۆ خالق و ڕەبێ ئەحەدە[7]
بۆ مە هنارتیە ئەحمەدە[8]
ڕەحمە بۆ جین و ئینسانە

---

(١) ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەفتی (٢٠/١١/٢٠٠٣)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) زیندی، ساخ.

(٣) ڕاسپاردە.

(٤) پێغەمبەران.

(٥) فرشتە، مەلائیکەت.

(٦) بێ هژمار.

(٧) ئێکانە.

(٨) ئێك ژ ناڤێن موحەمەد پێغەمبەری(س).

دامـــه دينـــێ ســـەعـــادەتـــێ[١]
بـــەرێ مـــە دابـــوو جـــەننـــەتـــێ
يـــێ خوســـار[٢] ئـــەوە ل ئۆمـــەتـــێ
نـــــەبـــــت تـــــابعێ قورئانــــــه

مزگينـــــى ل گونـــــد و بـــــاژێڕا
ل ســـەر مـــەدا هـــات شـــەڤـــا خێـــرا
خێـــرەك تێـــدا ب هـــزار خێـــرا
ئـــەڤـــەش[٣] فـــەضـــلا[٤] يـــێ ڕەحمانـــه

ئـــەڤ گۆتنـــە موبالغـــە[٥] نينـــە
گۆتنـــــا ڕەبولعالـــــەمينـــــه
قورئـــانێ شـــك[٦] تێـــدا نينـــه
يـــێ لـــێ ب شـــك بيـــت بـــێ ئيمانـــه

خـــودێ ســـوڕەتـــەك نـــازل[٧] كـــر
بـــەحســـێ شـــەڤـــا موبـــارەك كـــر
خێـــرا وێ شـــەڤـــێ زكـــر كـــر
بـــــۆ مرۆڤـــــێ بســـــلمانه

---

[١] خوەشبەختى.
[٢] زيان.
[٣] ئەڤە ژى.
[٤] باشى، قەنجى.
[٥] لێڤانە.
[٦] گومان.
[٧] هنارتەخوار.

کـــو ئـــەو لـــەیلـــەتولقـــەدر بـــوو
قورئـــان ل وێ شـــەڤـێ نـــازل[١] بـــوو
ئـــەڤـــە بـــۆ مـــە مزگینـــی بـــوو
حـــــەتـــــا دویمایـــــــا[٢] زەمانـــــــە

عیبـــــادەتـــــێ د وێ شـــــەڤێـــــدا
بـــــەرەکـــــەت دکـــــەڤیتـــــە تێـــــدا
نینـــــە چ خێـــــر ســـــەد هـــــزارا پێـــــدا
قورئـــان بـــۆ مـــە دکـــەت بـــەیانـــە[٣]

وێجـــــا[٤] ڕابـــــن برایێـــــت هێـــــژا
بـــــدەن صـــــەدەقـــــا و بکـــــەن نڤێـــــژا
زوو بشـــــوون ل گونـــــەح[٥] و قرێـــــژا
ب درســـــــــتی بـــــــبن بســـــــــلمانه

بکـــــەن صـــــەدەقـــــا دگـــــەل فـــــەقیـــــرا
هـــــەر وەکـــــی بـــــاب و بـــــاپیرا
دا نـــــە کـــــەڤنـــــە زەمهـــــەریـــــرا[٦]
دگـــــــەل کـــــــافر و موجرمانـــــــە[٧]

---

[١] هاتە خوارێ.
[٢] دویماهیا.
[٣] ئاشکرا.
[٤] ڤێجا.
[٥] گونەهـ.
[٦] سڕ و سەقەم.
[٧] گونەهباران.

بکەن تەوبە ل بال ڕەبێ خۆ
پیچەك كێم كەن گوناحێت[1] خۆ
موژیل[2] نەبن ب مالێ خۆ
وەکی فیرعەون و هامانە

ئەو شەڤ جوخینا[3] خێرایە
تێدا بکەن ڕێجا[4] و دوعایە
ل مە دەفعە[5] ببن ئەڤ بەلایە
بگرین ڕێکا بسلمانە

بکەن دوعا د ڤێ شەڤێدا
خۆ پاڤێن د بەختێ خودێدا
مە خلاص کەت د ڤێ فتنێدا
مە دویر بێخیت ل خرابانە

زۆر قورئانێ تێدا بخوینن
گوناحێت چووی بغەفرینن
ئیمانێ ب قورئانێ بینن
هەر ئەو ڕێکا مە هەمیانە

طاعەتێ بکەن قەت نە نڤن
قورئانێ بخوینن نە لڤن
بکەنە گری نە ئاخڤن
ل خۆ ڕازی بکەن یێ ڕەحمانە

---

(١) گونەهێت.

(٢) مژیل، مژوول.

(٣) بێدەر.

(٤) هیڤی.

(٥) پالدە.

هوشــيار بــه خــۆ غافــل نــەكــه
ئــەڤــێ شــەڤــێ ل دەســت خــۆ نــەكــه
ل ســالێ هــەمــێ ئــەو جــارەكــه
خێـــرەك تێـــدا ب ســـەد هزارانـــه

خــودێ ئــەو خــەلات لــەوا دامــه
دا پــێ زۆر كــەتــن خێرێــت مــه
چنكــی یــێ كێمــه عــەمــرێ مــه
ب نســـبەت[1] مرۆڤێـــت پێشـــانه

مـــه ڕێجـــا ل ڕەبـــێ باریـــه
مـــه عـــەفـــوو بكـــەت ئێكجاریـــه
ڕوی ڕەش نــەبــین ل نــاڤ قــەبریــه
ل نـــك جـــەواب و ســـئولانه

تفـــاق[2] بـــبن كـــورد و عـــەرەب
نــەمینیــت تــەفرقــه[3] و نــەســب
نــاڤ مــه نــەمیــنن بــێ ئــەدەب
نـــەزانـــن حـــوكمێ قورئانـــه

یـــاڕەبـــی تـــۆ بـــدەی ئێمنـــایێ
ڕاكــەی ل نــاڤ مــه ڤــێ غــەلایــێ[4]
بـــۆ خـــاترا بـــابێ فاطیمـــایێ[5]
ئــەو مــەحبــووبێ مــه هــەمیانــه

---

[1] بەرامبەر.

[2] ئێككگرتن.

[3] دووبەرەكی.

[4] خەلا، گرانی.

[5] مەبەست پێغەمبەرێ خودێ یه (س) كو فاتیما زەهرا (س) كچا ئەوییه.

گوند و بازێڕا ئاڤا کەی
تۆ ترسێ ل ناڤ مەدا ڕاکەی
یێ خراب ل ناڤ مەدا چێکەی
پێکڤە بژین وەك برانە

ب وی مناسبەتا[١] کو مە زانی
خەلاتکرین سەرۆك بارزانی
ب تەفسیرا قورئانا نۆرانی[٢]
بپارێزیت یێ ڕەحمانە

ئەڤە چێترین خەلات بوو
ل کوردستانێ بۆ مە هات بوو
هەموو ڕەحم و بەرەکات بوو
ل طەرەف[٣] ڕەبێ دەییانە[٤]

وێجا[٥] ئەم ڕێجا[٦] ت[٧] کەین ل خودا
بپارێزیت عەردێ کوردا
ل خائین و هەمی ئەعدا[٨]
ئەو حافظێ[١] مە هەمیانە

---

(١) هەلکەڤتا.

(٢) ئاماژەیە بۆ وەرگرتنا چەند دانەیان ژ (تەفسیرا هەژار) وەك دیاری ژلایێ سەرۆك (مەسعوود بارزانی) ڤە بۆ ئێکەتیا زانایان ـ لقا مویسل.

(٣) ئالی، ڕەخ.

(٤) دەیان: ژ ناڤێن خودایێ مەزنە کو ئەوێ زۆرداران دشکێنیت.

(٥) ڤێجا.

(٦) هیڤی.

(٧) د.

(٨) نەیارا، دوژمنا.

کوردستان جێگەی[٢] مێرانە
جهێ علم و عالمانە
کەس نەبێت کوردێ نەزانە
یێ دویرە ل دین و قورئانە

عیسا بەسە خۆ غافلکە
حەقیێ بێژە و عەمەل[٣] پێ بکە
بەسە خۆ ل ئاخرەتێ سلکە
بگرە رێکا صالحانە[٤]

---

(١) پارێزڤان.

(٢) جهێ.

(٣) کار.

(٤) قەنجان، چاکان.

## بسم الله ب ئیزنا خودێ[١]

بسم الله ب ئیزنا خودێ
ئەم ئەندامێت ئیتیحادێ
ڕابووین سەعەت شەشێ سپێدێ
مە کر قەصدا قوطبێ مەزن[٢]

حەفیدێ[٣] وی ئەمر دامە
چنکی ئەو ڕەئیس ئەندامە
بۆ زیارەتا بێ مەرامە
لێ دەفعە[٤] بن هەمم حەزن[٥]

حەفیدێ وی مێرسیدیە[٦]
خۆش عالم و تێگەشتیە
بەڕەڤانێ ڤێ دینیە
بپارێزیت ڕەبێ مەزن

وی گۆت قەلبێ مە یێ ڕەق بووی
شەیطانێ مە یێ ئەحمەق بووی

---

[١] ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٣/١٠/٨)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] مەبەست (شێخ نورەدین بریفکانی) یە.

[٣] نەڤیێ.

[٤] دویر.

[٥] خەم و نەخوەشی.

[٦] شێخ موحەمەد مێرسیدی.

زیــــارەتـــەك بـــۆ مـــە یـــا حـــەق بـــووی
ڕابـــــــن زی بـــــــن ببـــــــەزن

زیــــارەتــــا چـــــاك و ئـــــەولیـــــا
د حــــەلینیـــت جـــەرگـــێ صـــوفیا[1]
ت[2] بیتـــــە ســـــەبـــەب[3] بـــۆ ڕۆژیـــا
مـــــەدح و ثـــــەنـــا[4] ل ڕەبـــێ مـــــەزن

ڕابـــــن زیــــبن خـــۆ حاضــــر كــــەن
ویـــرد[5] و دوعاییــت خــۆ ل بــەر كــەن
قـــەصـــدا قـــەبـــرێ مونـــەور[6] كـــەن
ل خــــــودێ بترســــــن و بلــــــەرزن

ل حضـــــوورا[7] ڤـــێ قـــوتبێ[8] چیــــا
بـــــۆ خــــۆ بكـــــەن ڕێجــــا و هیڤیــــا
بكـــــەڤینـــــە ئـــــەمـــــن و خۆشـــــیا
ل مـــــە ڕازی بیـــــت ڕەبـــــێ مـــــەزن

بكــــــەن هیڤــــــی بكــــــەن دوعـــــایێ
ل حضــــــوورا بــــــابێ صـــــافیایێ[9]

---

[1] دەمێ سوفی سەردانا شێخ و وەلیێن خودێ دکەن، دکەڤنە سەروبەرەکێ نە سرۆشتی دا.

[2] د.

[3] هوکار، ئەگەر.

[4] پەسن.

[5] تەسبیحات.

[6] ڕۆناهی.

[7] ئامادەبوونا.

[8] مەزنە زانایێ سوفیان.

[9] زانا و هەلبەستڤان شێخ نورەددینێ شێخ عەبدولجەببار بریفکانی (١٧٩٠-١٨٥١)ێ.

ئێمناهی بکەڤیتە دونیایێ
پێکڤە بژین گورگ و بزن

ل حضوورا چاك و ئەولیا
خودێ قەبوول دکەتن دوعا
هەوارا مە ل ڕەبولسەما[1]
مە دەرکەت ڤێ فتنا مەزن

ڤێ فتنا ئەم کەفتینە تێدا
شەیطانی تەوقیعەك لێدا
وی وەربوو دێ مینین تێدا
لەعنەت ل سەر بن پیسێ مەزن

برا ما ئەو قوطب کیە
نوورەددینێ بریفکیە[2]
حەوجەی تەعریفا[3] وی نیە
ئەو بوو قوطب و شێخێ مەزن

خودان کەشف و کەرامەت[4] بوو
خەلوەخانن[5] و عیبادەت بوو
ئەوراد خوینێ بێ عەدەت بوو
ئەو مەحبووبێ ڕەبێ مەزن

---

(١) خودایێ ئەسمانا.

(٢) شێخ نورەددینێ بریفکانی.

(٣) پێناسە.

(٤) کارەکێ حنێرانە کو لدەڤ مەزنە زانایێن سوفیان دهێتە مێزەکرن.

(٥) جهی بێدەنگ و ئارام بۆ پەرستنا خودایێ مەزن.

مـــه ڕێجـــا ڕەبـــێ عیـــزەتـــێ
جهـێ مـه چـێ بکـەتـن ل جنـەتـێ
ببینـــه ئـــەهلـــێ ســـەعـادەتـــێ
کـەیفخـۆش بـبن ب جـائیزا[1] مـەزن

عیســـای شـــعرا خـــۆ ڤـــەهینـــا
وی هـەر قـەسـەك[2] ل جیـەکـی[3] هینـا
عـــەجـــەلـــە[4] کـــر وەکـــی دینـــا
دا بیتـــه نـــاڤ ســـاحا[5] مـــەزن

صـــەلات و ســـلام ب هـــزار هـــزار
نـــك خـــالق و ڕەبـــێ جـــەبـــار
ل ســـەر ڕوحـــا نـــەبیـــێ موختـــار[6]
ئـــەو شـــەفیعـــه ل ڕۆژا مـــەزن

---

(1) دیاری.

(2) ئاخفتنەك.

(3) جهەکی.

(4) لەز.

(5) گوڕەپانا.

(6) هلبژارتی.

## بەحسێ میعراجێ[1]

بناڤێ خودێ دێ دەستپێ کەم
ئەز دێ بەحسێ میعراجێ[2] کەم
تەوەککولێ ل سەر خودێ کەم
ئەو موعینێ مە هەمیانە

بیست و حەفت ل ڕەجەبێ تەمام
ئەمر کر ڕەبێ لایەنام[3]
هنارت جبریل علیەالسلام
بۆ خاتەمێ ئەنبیانە

ل گەل خۆ ئینا بۆڕاقا[4] ڕەنگین
لێ سیار بوو ڕەسولێ ئەمین
ئەو ل مەککەهێ چوون و مەشین[5]
بۆ بازێڕێ ئەنبیانە

کو ئەو بەیتولموقەدەس بوو

---

(1) ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەفتی (٢٠٠٣/٩/٢٥)ێ، ل بازێڕێ دهۆکێ هاتیە ڤەهاندن.

(2) شەڤا ئیسرا و میعراج پێغەمبەرێ (س) بەرەڤ ئەسمانا چوو بوو.

(3) یێ کو نە نڤیت.

(4) ئەو دەوارە ئەوا پێغەمبەرێ خودێ (س) لێ سویار بووی و چووی ئەسمانا.

(5) دانەڕێ.

جهـــێ خۆشـــی و بـــەرەكـــەت بـــوو
بـــاژێڕەكـــێ موونـــەوەر[١] بـــوو
ل بـــەر وان چـــاك و ئـــەنبیانـــە

پێغـــەمبـــەر ل وێـــرێ وەســـتا بـــوون
چاڤـــەرێـــت نـــەبیـــێ موختـــار بـــوون
بـــۆ نڤێـــژێ ئـــەو صـــەف صـــەف[٢] بـــوون
موحـــەمـــەد ئیمـــامێ هـــەمیانـــە

لێـــرە[٣] مـــەعلـــووم بـــوو بـــۆ بـــەیـــان
بـــلا بـــزانن ئیـــنس[٤] و جـــان
موحـــەمـــەد ســـەیـــدایێ هـــەمیـــان
دژمنـــێ كـــوفر و شـــەیطانـــە

پاشـــی بلنـــد بـــوو بـــۆ ســـەمـــا[٥]
دگـــەل وی ســـەفیـــرێ ئـــەنبیـــا
جبریلـــێ قاصـــدێ[٦] خـــۆدا
بـــۆ ڤـــەبـــوون دەرگێـــت عـــەســـمانە

---

[١] ڕۆناهی.
[٢] ڕێز ڕێز.
[٣] ڤێرێ، ڤێرە.
[٤] ئینسان (مرۆڤ).
[٥] خوەشی.
[٦] هنارتیێ.

طـــەبـــەق طـــەبـــەق[١] ئـــەو بلـنـــد بـــوو
جبرائيـــــــل ڕەفيقـــــــێ[٢] وی بـــــــوو
كـــەيفخۆشـــی بـــۆ وی پـــەيـــدا بـــوو
ل نێزيكيـــــا ڕەبــــێ ڕەحمانـــــــه

جبريلــــی گـــۆت ئـــەی ئـــەحمـــەده
ئێـــــره بـــــۆ مـــــن ئـــــاخر حـــــەدده[٣]
ب ئـــــەمـــــرێ واحـــــدێ ئـــــەحـــــەده[٤]
تـــــۆ هـــــــەره خزمـــــەت دەيانــــــه

وێجـــــا[٥] گـــــۆت ئـــــەحمـــــەدێ دەلال
يـــــا جبرائيـــــل يـــــا خـــــۆش هـــــەڤـــــال
كـــــا براينيـــــا مـــــه ل هنـــــده ســـــال
ل ڤێـــــره تـــــه كرمـــــه حـــــەيرانـــــه

جـــــەواب دا جبريلـــــێ ئـــــەمـــــين
عـــــاجز نـــــەبـــــه (سيدالمرســـــلين)[٦]
ئـــــەم نـــــەشـــــێن پيـــــەكـــــێ دی بچـــــين
ئـــــەڤـــــه فـــــەرمانـــــا ڕەحمانـــــه

---

[١] قات قات.

[٢] هەڤالێ.

[٣] دويماهيك سنوور.

[٤] خودايێ ئێكانه.

[٥] ڤێجا.

[٦] سەروەرێ پێغەمبەران.

پاشی ب ڕێکەفت جەد[1] ولحوسەین[2]
نێزیک بوو ل خودێ قاب قەۆسین[3]
حەقق ل سەر مە صەلەواتا لێبدەین
ئەو بوو مێڤانێ دەیانە[4]

پاشی دا وی خەلاتێ مەزن
پێنج نڤێژ ل سەر مە فەڕضکرن
ئەڤە ل هەموو هەدیا[5] چێترن
بۆ مرۆڤێ بسلمانە

پاش زڤڕی هاتەڤ[6] خارە
گەشتە[7] نک موسای نازدارە
موسای گۆت نەبیێ موختارە
چ داتە ڕەبێ ڕەحمانە

گۆت یا موسا برای هاروون
پێنجی نڤێژ ل سەر مە فەڕض بوون
خەلاتێ مەزن ئەڤە بوون
ئەو ل طەڕەف ڕەبێ دەیانە

---

(١) باپیر.

(٢) حوسەینێ کوڕێ عەلی کوڕێ ئەبی تالبی، نەڤیێ پێغەمبەری (س).

(٣) ب ئەندازەیا دوو کڤانان.

(٤) دەیان: ژ ناڤێن خودایێ مەزنە کو ئەوێ زۆرداران دشکێنیت.

(٥) دیاری.

(٦) هاتەڤە.

(٧) گەهشتە.

موسای گۆت ڕەسولێ ئەمینە
پێنجی نڤێژ هەونتە[1] نینە
ئوممەتا تە قووەت[2] نینە
هەرەڤ نک ڕەبێ ڕەحمانە

هات و چوو دەهـ دەهـ کێم کرن
حەتا ل پێنجا عاسی[3] کرن
حەمد و شوکرێت خودێ کرن
خێرا وا یا پێنجەهانە

ڤە زڤریڤە ب ئەمرێ ڕەبێ خۆ
وی شەڤێ گەشتەڤ[4] مالا خۆ
ئەو نڤست لبن لحێفکا خۆ
هێش نەبیە مەلا بانگدانە[5]

وەختێ قسە[6] مونتەشر[7] بوو
یێ مونافق[8] پێ کافر بوو
بسلمان پێ پڕ باوەر بوو
کافرا گۆت ل ڤا[9] سحرانە

---

[1] هەوانتە (هوسا).

[2] شیان.

[3] ئاسێ.

[4] گەهشتەڤە.

[5] هێشتا نڤێژا سپێدێ نەبووی.

[6] ئاخفتن.

[7] بەلاڤ.

[8] دووڕوی.

[9] ڤان، ئەڤان.

وی زۆر تشـــت ل عـــەســـمانا دیـــتن
قـــەومـــەك یـــێ گـــەنمـــی دچینیـــتن
هـــــەر د وێ گاڤێـــــدا د ریـــــتن
ل پـــێش چـــاڤێ خـــەلکـــی هـــەمیانـــە

گـــۆتێ جبریـــل ئـــەڤـــە کـــی بـــوون
گـــۆتێ ئـــەڤـــە موجاهـــد[١] بـــوون
خێرێـــت وان هـــەر لـــێ زێـــدە ت[٢] بـــوون
حـــەتـــا گـــەهنـــە حـــەفـــت صـــەدانـــە

ئـــەوی هایـــل[٣] هنـــدەك ژنـــا بـــوو
هـــــەوار هـــــەوار و وەیـــــلا بـــــوو
گـــۆت جبرایـــل ســـەبـــەب[٤] چ بـــوو
عـــــەذاب دانـــــا ڤـــــان ژنانـــــە

---

[١] ئەوێن د رێکا خودێ دا شەڕی دکەن.

[٢] د.

[٣] ئاگەھ.

[٤] ئەگەر، هوکار.

گۆت نـەتکـر[1] ئیطاعـا[2] ڕەبـێ خـۆ
گـویێ[3] خـۆ نـەددانـە مێرێـت خـۆ
ڤـەنـەتشـارتن[4] جوانییێـت خـۆ
ئـەو بـوون گۆهـدارێت شـەیطانـە

بـرا ژنێـت ڤـێ زەمـانی
ئـەگـەر لـێ ببـڕن ئـەزمـانی
دێ فـرەکـەن[5] گریڤـانی[6]
دا دیـار کـەت سـینگێ وانـە

مێـر و خزمێـت ئـەڤـا ژنـا
مـەسـئوولن[7] ل نـك ڕەبولسـەمـا[8]
شـریکن[9] دگـەل بـۆ گونـەهـا
ئـەگـەر نـەکـەن مـەنعـا وانـە

عیسـای چـەنـد کـەلیمـە گـۆتن
ئاخڤتنێـت وی وەك بـزووتن
مێلاکێـت شـەیطـانی سـۆتن
ئـەڤـە شـۆلا شـاعێرانە

---

(1) نەدکر.

(2) گوهداری.

(3) گوهێ.

(4) ڤەنەدشارتن.

(5) فرەهـ.

(6) بەرسینگ.

(7) بەرپرسیارن.

(8) خودایێ ئەسمانا.

(9) هەڤپشك.

ملیـــون صـــەڵات و هـــەم ســـەلام
ل ســەر ڕوحــا نــەبیــێ خــاص و عــام[1]
موحـــەمـــەدێ شـــیرین کـــەلام[2]

شـــــەفیعـــــێ مـــــە بســــــلمانە

---

[1] تایبەت و گشتی.

[2] ئاخفتن.

## زمواجا ئیسلامی[1]

بناڤێ خودێ ئەز دێ بەحس کەم
بەحسێ حەفلا[2] ئیسلامێ کەم
دێ عەمەلی[3] ب قورئانێ کەم
هەر ئەو فایدێ مە هەمیانە

برا ما ئەو حەفلە چیە
ئەو عەمەلەکێ دینیە
دهول و زڕنا تێدا نیە
دویرە ل ڕەقص و داواتانە

داواتا ژن و مێر تێدا
مەعلووم شەیطان ت[4]سەر چوپیدا
ئیمان نامینیت د وێرێدا
چنکی سویکا گونەهانە

بەدەل موسیقا و زڕنایێ
بۆ زاڤای دێ کەین دوعایێ
بەدەل ستران و سەمایێ
دێ خوینین نەشیدە[1] و قورئانە

---

(1) ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی ٢٠٠٣/١١/٣٠ ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

(2) ئاهەنگ.

(3) کاری.

(4) د.

ئــەمـــر كـــر نـــەبيـــێ ئيســـلامێ
ژنـــا بيـــنن تـــە بـــاى عـــامێ
طـەبـق[٢] كـەن شـەرعـێ ئيسـلامێ
ل هــــەمــــى وەخــــت و زەمانانـــــە

ئــــەمــــر كــــر ڕەســــولێ مــــەزن
گـــەلـــى جـــاحێلا ژنـــا بيـــنن
ئـــەگـــەر هنگـــو مـــەهـــر هـــەبـــن
ئـــــەگــــەر نـــــە بگـــرن ڕۆژيانــــە[٣]

هــەر كــەســێ كــو ژنــێ بينـــى
ئـــەوى گـــرت نيڤـــەكـــا دينـــى
نيڤـــا مـــايى نـــەبـــن دينـــى
ببيـــە گوهـــدارێ شـــەيطانـــە

ژن شــــريكا حــــەياتێيــــە[٤]
هــــەم فايــــدە يــــێ ئــــاخرەتێيــــە
هاريكـــــارا ئوســــــرەتێيــــــە[٥]
هــــەمــــى وەقــــت و هــــەمــــى ئانــــە[٦]

---

(١) سروود.

(٢) بجهبينن.

(٣) د فەرموودەيەكا پێغەمبەرى (س) دا هاتيە ئەگەر نەشێ ژنێ بينى، ژبۆ دويركەڤتن ژ گونەهان ڕۆژيان بگرە.

(٤) ژن هەڤپشكا ژيارێ يە.

(٥) مالباتێ، خێزانێ.

(٦) دەم.

ویجا[١] هوشیار به و بزانه
ژنا ب ئەخلاق یا چەوانه
بەرێ خۆ بدە دای بابانه[٢]
پاشی سەحکە کچا وانه

پێغەمبەر بۆ مه ت[٣] کەت بەیان[٤]
گۆت هشیار بن ل وێ ژنا جوان
یا پەیدا بووی ل ناڤ بێ ئەصلان
نەکە ب دەتەڤ دای بابانه

گوهداری نەبیێ موختار کەن
یا بسلمان ل خۆ مار کەن
هەر سێکێت[٥] دی نه ئیختیار[٦] کەن
دێ بن مەجنوون و حەیرانه

ژنا ب دین بیت و قورئان خوین
چێتره ل یا ب مال و زەنگین
هەم چێتره ل جوانا بێ دین
چێتره ل خودان ئەصلانه

---

[١] ڤێجا.

[٢] هەر وەکی گوتنا مەزنا دبێژیت: ژنا بینه ژ عەسلیا دا ببینی عەجێبیا.

[٣] د.

[٤] ئاشکرا.

[٥] ژن ل سەر ئەڤان خالان دهێنه مارەکرن: ١. ئایینێ ئەوێ ٢. جوانیا ئەوێ ٣. بنەمالا ئەوێ ٤. مالێ ئەوێ. لێ ب تنێ یا خودان ئایین هەلبژێره.

[٦] هلبژارتن.

ژنا خراب و پنط پنط[1] کەر
ئان یا پیس بیت و چاڤ ڤەدەر
ل مێری دێ مینن کول و کەسەر
یێ سەر شووڕە ل دیوانانە

ژنا خراب و بێ ڕەحم
مێرێ د سۆژیت دکەتە فەحم[2]
دێ بێژیت ئەز یا بێ گونەحم[3]
هەموو سویچێ[4] زەلامانە

برا ئەگەر ژنا پیس بیت
مێرێ وێ دێ زیکا پیر بیت
دەستێ وێ دا دێ ئێخسیر بیت
دێ کەڤیتە کولانانە

نەصیحەت[5] ل بابێ کچا بیت
پیچەك ڕەحم د سەری دا بیت
مەهر زێدەی حەدی[6] نەبیت
زاڤا بکەڤیتە کولانە

---

(١) (پنت پنت) واتە (پت پت).

(٢) ڕەژی.

(٣) گونەهم.

(٤) سویجێ، هۆکارێ.

(٥) شیرەت.

(٦) سنوور.

وەلــەو مــەهــریَ نینــە چ حــەد
بــەلــیَ ل دینــی باشــە وەســط[١]
زێــدەتــر دیَ بیتــە قــەبــەحــەت[٢]
بــــــــۆ مرۆڤــــــــیَ بســــــــلمانە

هیڤیــا مــە ل ڕەبولعالــەمــین
بیــك و زاڤــا پێکڤــە بــژین
ل ســەر ئولفــەت[٣] و خۆشــی و دیــن
دائیمــــەن[٤] بخــــوینن قورئانــــە

عیســای چــەنــد ئــاخڤتن کــرن
گــەلــەگ جحێــل ل خــۆ سـلکرن
چ قــەســێت خــۆش بــو نــەکــرن
ئــــەڤــــە عــــادەتــــیَ پیرانــــە

صــەلات و ســەلام ل نــك خــودا
ل ســەر نــەبیــی موحــەمــەدا
هنـــدی خێرێـــت دونیاییێـــدا
دگــەل دار و بــەر و بــەلگانــە

---

[١] ناڤنجی.

[٢] شەهمزاری.

[٣] حەزژێکرن.

[٤] بەردەوام، هەردەم.

# فیدرالیەتێ چ ضەرەرا دینی نینە[1]

فیدرالیـــــەت یـــــان جـــودا بینـــــی
چیــــە ضـــــەرەرا[2] وێ ل دینـــــی
لازم[3] تــــۆ خــــۆ تێبگـــــەهینـــــی
نـــەبیــــە گوهـــــداری فــــەســــادە

فیدرالیـــــەت بـــــۆ مـــــە کێمــــــە
بـــــەلـــێ یـــێ گـــۆتی مـــەزنێمـــە
ئــــــەو رێبــــــەرێ مللــــــەتێمــــــە
ناشـــکێنین دگـــەل وی چ عـــەهـــدە[4]

چـەنـد مـەنشـورات[5] نـەشـر[6] کـرن
مللـــــەتـــێ کـــورد کـــافر کـــرن
ئایـــەت ل نـــك خـــۆ تـــەئویـــل[7] کـــرن
حـــەلالکـــرن کوشـــتنا کـــوردە[8]

---

[1] ئەڤ هۆزانە ل رێککەڤتی (٢٠٠٤/٢/١٠)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[2] زیان.

[3] پێدڤی.

[4] سوز.

[5] بەلاڤوك.

[6] بەلاڤکرن.

[7] شرۆڤەکرن.

[8] ئەڤە دەمێ مەلاییێن عەرەبان ل رۆژا ئەینیێ سەر مینبەرا دگۆتن: فیدرالیەت کوفرە و نەیا درۆستە.

برایــێ عــەرەب ئــەگــەر وەبیــت
لازم عـــەرەب ئێـــك دەولـــەت بیـــت
یــان دێ کــوفرا وا ل پــێش مــە بیت
عـــالم واحیـــد و ئـــەلئـــەحـــەدە[1]

فیدرالیـــــەت د ڤـــێ وەختیـــــدا
دەرمانــــە ل[2] عـــــەرەب و کـــــوردا
دا نـــــەهێلــــین چ حیقـــــدا[3]
ببیتـــەڤ حـــەڕپـــول[4] ئیبـــادە[5]

شـــەڕ بکـــەڤیتـــە نـــاڤ بـــاژێرا
خـــۆ دیـــار کـــەن کوڕێـــت شـێرا
ظـــوڵم نـــەمینیـــت ل ســـەر مێـــرا
مـــە ڕزگـــار کـــەن ل ڤـــان قـــەیـــدە

مــــە ل ڤـــێ ظـــوڵمێ[6] دەربیـــنن
بەس قەصر و گوندا ل مە بسگینن
مــە تــەرحیــل[7] کــەن و بــەزیــنن
نـــەبـــن خـــۆدان ملـــك و عـــەردە

بـــەرطـــەنگیـــێ[1] دگـــەل وا براینـــە

---

[1] ئێکانە.

[2] بۆ.

[3] کەرب، کین.

[4] شەڕ، جەنگ.

[5] کومەڵکوژی.

[6] ستەم.

[7] ڕاکرن ژ واری.

د خۆشییێ دا نەسلا جینانینە
ل جەبهادا[٢] پێشیا شەڕاینە
کورد یێ خودان سۆز و عەهدە

ب جەماعی[٣] ئەم دەفن[٤] کرین
هەم بساخی ئەم بن ئاخ کرین
ئەم هێتیم و سێوی کرین
نە ترسیان ل ڕەبێ صەمەدە

ئەوان ب کیمیاییێ[٥] سۆتین
ئەنفال[٦] کرین ئەم فرۆتین
وەختێ زانی ئەم بزۆتین
مەعدووم[٧] کرین ب ئەرد و ئەردە

بلا بزانن ئەم پڵنگین
خودان خەنجەر و تڤەنگین

---

(١) بەرتەنگییێ.

(٢) بەرەییێن شەڕی.

(٣) پێکڤە، هەڤڕا.

(٤) ڤەشارتین.

(٥) ل سالا (١٩٨٨) ڕژێم عیراقێ یا ئەوی سەردەمی باژێرێ حەلەبچە کیمیا بارانکر د ئەنجامدا پێنج هزار شەهید بوون.

(٦) پشتی شەڕێ عیراقێ و ئیرانێ ل سالا (١٩٨٨)ێ ب داوی هاتی، ڕژێما عیراقێ یا ئەوی سەردەمی دەست ب هێرشان دژی کوردان کرن و د ئەنجامدا چار هزار گوندێن کوردان وێران کرن و سەد و هەشتێ و دوو هزار کورد بەرزە و شەهید کرن.

(٧) ژناڤبرن.

شۆڕشـــگێڕین ئـــەم نـــەهـــەنگـــین[١]

ناچیـــــــت تـــــــۆلا دای وەلـــــــەدە[٢]

کـــاوەی[٣] د وەختـــێ خـــۆدا چکـــر

وی چـــەکـوچێ خـــۆ دگـــەل خـــۆ بـــر

ضـــوحاك كوشـــت و ئـــاگر هـــەلكـــر

ل خـــەلكـــێ بوویـــە كـــەیـــف و مـــژدە[٤]

قائیـــدێ[٥] كـــورد صـــەلاحـــەددیـــن[٦]

غیـــــرەت كێشـــــێ دونیـــــا و دیـــــن

ئـــــەوی ئـــــازاد كـــــر فـــــەلـــــەســـــطین

بلنـــــد كـــــر ئـــــالایێ ئـــــەحمـــــەدە

مێرخاصـــــــێت گـــــــەلـــــــەك د زۆرن

هـــەمـــوو ت[٧] مـــەعلـــووم و مـــەشـــهۆرن[٨]

د ســـــەر بلنـــــدن نـــــەت[٩] مـــــەغـــــرۆرن[١٠]

وەكـــــــی قاضـــــــی موحـــــــەمـــــــەدە[١]

---

(١) حویتین.

(٢) زارۆك.

(٣) كاوەیێ ئاسنگەر.

(٤) مزگینی.

(٥) سەركردە.

(٦) سەلاحەدین یووسف نەجمەددین ئەیووب دامەزرێنەرێ ئەیووبیان (١١٦٨ـ١٢٥٠)ێ، سەلاحەدین ب قەهرەمانێ شەرێن خاچپەرستان هاتیە نیاسین.

(٧) د.

(٨) ناڤدار.

(٩) نەد.

(١٠) دفنبلند.

شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی[2]
ڕێکا ترسێ قەد نەت[3] زانی
ئەوی نەت[4] ڤیا ملك و خانی
دگۆت دنیا یێ بێ وەعدە

پاشی هات و شێرێ مەزن[5]
وی پێشمەرگە تەشکیل[6] کرن
ئەندامێن خۆ تەنقیم[7] کرن
ئەوان بەستن[8] سۆز و عەهدە

دەستێ خۆ هاڤێت خەنجەرێ
سویند پێ خاریوو وەکی بەرێ
کوردا ل ظولمێ ئینمە دەرێ
ب هاروکاریا[1] یێ ئەحەدە[2]

---

[1] قازی مەحەممەد، دامەزرێنەرێ کۆمارا کوردستان(١٩٤٦)ێ بوو ل (٣١ ئاداری ١٩٤٧)ێ، ل مهاباد هاتە سێدارەدان.

[2] شێخ عەبدولسەلام بارزانی، دناڤبەرا سالێن (١٩٠٧-١٩٠٨)ێ، دژی دەولەتا عوسمانی شۆڕەش کر، ل سالا (١٩١٤)ێ ل باژێرێ (مویسل) هاتە سێدارەدان.

[3] نەد.

[4] نەد

[5] مەلا مستەفا بارزانی ل (١٤ ئادارا ١٩٠٣)ێ، ل گوندێ بارزان هاتیە سەر دونیایێ ب ناڤدارترین و مەزنترین ڕێبەرێ تەڤگەرا ئازادیخوازا کورد دهێتە هژمارتن، گرنگترین خال د ژیانا بارزانیدا چوون و زڤرینا ئەوی ژ ڕووسیا (١٩٤٦-١٩٥٨)ێ، و ڕێبەریا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)ێ بوو ب، ل سالا (١٩٧٩)ێ مالئاڤایی کر.

[6] دامەزراند.

[7] ڕێکخست، ڕێکوپێك.

[8] گرێدان.

بەلێ ب تەقدیرا[٣] خودا
ئەجەلێ قەد موهللەت[٤] نەدا
چوو بەر ڕەحما یێ ئەحەدا
نەگەشتە خۆشی و مەقصەدە[٥]

پاشی وی هات شێرێ زەمان[٦]
دانە شولێ قەلەم و ئەزمان
ئەوی ئازاد کر کوردستان
ل دوژمنی مان کول و دەردە

ئەوی حوکم کر ل ئەقلیمێ[٧]
سۆتن مێلاکێت لەئیمێ[٨]
نەمان چ جێ[٩] بۆ ڕەجیمێ[١٠]
کەلی ب ئاگرێ بوغچ[١١] و حیقدە

دۆژمن ڕابوو کەفتە حیلا

---

(١) هاریکاری.
(٢) ئێکانە.
(٣) حەزا خودێ.
(٤) دەرفەت.
(٥) مەبەست.
(٦) مەبەست (مەسعوود بارزانی) یە.
(٧) هەرێم.
(٨) نەباش، خراب.
(٩) جە.
(١٠) ڕژیمێ.
(١١) کەرب، کین.

مـال ل خـۆ خـڕاب کـر ب بـەرتـیلا
زێـــڕ دانـــە خـــەلکـــێ ب بـــەڕمـــیلا
نـــەگـــەشـــتـە[١] مـــەقصـــەد و فایـــدە

ئـــــەخیـــــرەن ڕابـــــوون چ کـــــرن
وا دوو ســـــەفیـــــە[٢] ســـــەردا بـــــرن
وان نـــەفســـێت خـــۆ تـــەفجیـــر[٣] کـــرن
ل دوو بنگـــەهێـــت شـــێرێت کـــوردە

وان گـــــۆت دێ کـــــوردا ترســـــینن
بـــەلکـــی وازێ[٤] ل فیدڕالیـــەتـــێ بیـــنن
ڕەحـــەت[٥] بـــن ل مـــالا خـــۆ ڕویـــنن
تـــەمبیـــبن ئـــەبـــەد و لئـــەبـــەدە[٦]

ڕۆژا ئـــــەوەل ل جـــــەژنـــــا مـــــەزن
دوو تـــــەفجیـــــرات وان چێکـــــرن
پتـــر ل ســـەدا شـــەهیـــد کـــرن[٧]
ل هـــەڤلێـــرێ عاصـــیما[٨] کـــوردە

---

[١] نەگەهشتە.

[٢] کێم ئاقل.

[٣] پەقاندن.

[٤] دەست ژێ بەردەن.

[٥] سانەهی.

[٦] هەتا هەتا.

[٧] مەبەست ئەو ڕۆژە ئەوا هەڤدەم ل گەل ڕۆژا ئێکێ یا جەژنا قوربان کو چەند خوەکوژان ب شێوەیێ جودا خوە دناڤ بارەگایێن پارتی دیمۆکراتی کوردستان ـ عیراقێ و ئێکەتیا نیشتیمانی کوردستان- عیراقێ کو د ئەنجامدا هژمارەکا زێدە شەهید بوون.

[٨] پایتەختا.

نـــەزانـــى ئـــەم كـــورد ئارينـــە
ترســـيان ل نـــك مـــە قـــەت چ نينـــە
يـــا مـــوهم[1] ل نـــك مـــە بـــەس دينـــە
ئـــو بـــەرەڤانيـــا مـــافێ كـــوردە

عيســـاى نـــەكـــرن چ خـــەبـــات
پشـــتى كـــو پيـــرى ب ســـەردا هـــات
لـــێ زێـــدە بـــوو حوببـــا[2] وەلات
ئـــەو نـــەگـــەهشـــتە چ مـــەقصـــەدە

(1) گرنگ.
(2) حەژێكرنا.

## مرنا زانایی مرنا جیهانێ[١]

ل ڕۆژا دەهێ ل هەیڤا دوو بوو
سالا دوو هزار و چارێ بوو
سەیدایێ صدیق[٢] ل مە بەرزە بوو
چو بەر ڕەحما خودێ مەزن

ل ڕۆژا کو من مەرحووم[٣] ناسی
بووینە برا ب ئیخلاسی
هەم عالم[٤] بوو هەم سیاسی
هزار ڕەحمەت ل گۆڕێ بن

عیزەتولنەفس ل نك وی هەبوو
ل سەخاوەتی[٥] کێم ئەمثال[٦] بوو
خودان غەزەل[٧] و نوکتە بوو
ل نك وی ئێك بوون کچکە[٨] و مەزن

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٢/١٠)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] مەلا سەدیق کوڕێ مەلا عەبدوڵڵاهێ سۆرانی، پێشنڤیژ و گۆتارخوینێ مزگەڤتا مەزنا باژێڕێ بەردەڕەش. ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٢/١٠)ێ، ل ئەڤێ جیهانێ مالئاڤیی کر.

[٣] خودێ ژێ ڕازی.

[٤] زانا.

[٥] دەستڤەکری، مەرد.

[٦] بێ وێنە.

[٧] ڕستن.

[٨] بچویك.

مـــدير مـــەعهـــەدێ[1] دينـــى بـــوو
ئيمـام[2] و خـەگـيبێ[3] ڕسـمى[4] بـوو
مســۆولێ عولــەمائێــت[5] دينــى بــوو
ل ناحيـــا[6] بـــەردەڕەشـــێ مـــەزن

يـــێ وەســـەط[7] بـــۆ د عـــەقيدێـــدا[8]
دويـــر ل (ئيفـــراط و تفريطـــى[9]) دا
ئـــەو بـــۆ مـــوفتى د مـــەنطـــەقـــێ[10] دا
غيـــرەت كێشـــێ شـــەرعـــێ مـــەزن

هـــەلگـــرت بـــۆ ڕێكـــا بـــابێ خـــۆ
ل وى كێمتـــر نـــەبـــوو ب عيلمـــێ خـــۆ
لـــێ وەرگـــرت بـــوو ئـــەخلاقـــێ خـــۆ
لـــەوا بيـــە ئـــەو شـــێخى مـــەزن

ڕيجـــا[1] و هيڤيێـــت مـــە ل ڕەبـــێ وى

---

(١) پەيمانگەه.

(٢) پێشنڤێژ.

(٣) گۆتارخوين.

(٤) فەرمى.

(٥) زانايێن.

(٦) دەمێ هەلبەستڤانى ئەڤ هەلبەستە ڤەهاندى، هێشتا (بەردەڕەش) ناحيە بوو، لێ نوكە قەزايە.

(٧) ناڤنجى.

(٨) بيروباوەرى.

(٩) ژ توخويبێ دەركەڤيت.

(١٠) دەڤەرێ.

ستر[2] بکەت زۆریەتا[3] وی
ل سەر ئەخلاق و عەقیدێت وی
حفظ[4] بن ل بەلایت مەزن

هیڤیدارین ل ڕەبێ خۆ
عەبدوڵلا[5] بگریت جێ بابێ خۆ
ب عیلمێ خۆ هەم ئەخلاقێ خۆ
چنکی ئەوە کوڕی مەزن

برا دونیا یا هوسایە
مرن ڕێکا مە هەمیایە
مرنا تە جهێ ئەسەفایە[6]
ل نک عالم و شێخێت مەزن

هەر چی ڕۆژا ل مە ئاڤا بوو
مرن نێزیکی هەمیا بوو
لەزەت نەما ل مە وندا[7] بوو
بێ فایدەنە مەر و بزن

ئەگەر ئێک مابا ل دونیایێ

---

(١) هیڤی.
(٢) پارێزیت.
(٣) دویندەه.
(٤) پاراستی.
(٥) مەلا عەبدوڵلا کوڕێ مەلا سەدیق کوڕێ مەلا عەبدوڵلاهێ سۆرانی یە.
(٦) مخابنیێ.
(٧) هندا، بەرزە.

دا مینیـــــت بــــابێ فاطیمـــــایێ[١]
دونیـــا یـــا پیســـه ب کێــر نـــاهێ
لـــەوا مـــا شـــەیطـــانێ مـــەزن

ب خێــر بچـــی ئـــەی برایـــێ نـــازدار
ب کـــەڤیـــه خۆشـیا ب لیـل و نهـــار[٢]
ل تـــه ڕازی بیـــت ڕەبـــێ جـــەبـــار
ئـــەوە یـــێ کـــەریـــم[٣] و مـــەزن

هیڤیـــا مـــه ل ڕەبـــێ عـــزەتـــێ
جهـێ تـه خـۆش کـەتـن ل جـەنـەتـێ
ل تـــه مێڤـــان بـــبن ل بـــەحـــەشـــتێ
ئـــەوە خۆشـــی و حـــەفـــلا[٤] مـــەزن

تـــۆ بـــووی وارپ و ئـــەلئـــەنبیـــا دا
ئینشـــائەڵـــلا لـــێ نـــابی جـــودا
حـــەشـــرا تـــه دێ بیـــتن دگـــەلـــدا
دێ وەرگـــــری جـــــائیزا[٥] مـــــەزن

عیســـای نـــەکـــر تـــەوبـــه ب درســـتی
ڕۆژێ یـــێ ب شـــول ب شـــەڤ نڤســـتی
حـــەتـــا لـــێ مـــان چـــەرم و هـــەســـتی
هنـــد هـــایلێ[٦] بـــوو بـــۆ هـــات مـــرن

---

[١] مەبەست پێغەمبەرێ خودێ یه (س).

[٢] شەڤ و ڕۆژ.

[٣] مەرد، دەست ڤەکری.

[٤] ئاهەنگ.

[٥] دیاری.

[٦] ئاگەه.

هـــزار صـــەلاوات دگـــەل ســـەلامـــا
ل نـــك خـــالقێ ئـــەرض[١] و ســـەمـــا[٢]
ل ســـەر ڕوحـــا نـــەبیـــێ مـــە هـــەمـــا
ئـــــەوە شـــــەفیـــــع ل ڕۆژا مـــــەزن

[١] ئەرد.
[٢] ئەسمانا.

## مام دناڤ قەومێ غەریب[1]

یـــا ئیلاهـــی[2] ئـــەز غـــەریـــبم
دائیمـــەن[3] هـــەر دل کـــەئیـــبم[4]
بـێ حـەکـیم[5] و بـێ طـەبیـبم[6]
مـــام دنـــاڤ قـــەومـــێ غـــەریـــب

غـــەریبـــێ ســـیه و شـــەش ســـالم[7]
شـــــەڤ و ڕۆژ دئـــــێم دنـــــالم
کـــەس نینـــە بپرســـیت ل حـــالم
مـــام دنـــاڤ قـــەومـــێ غـــەریـــب

ل میســـلێ مـــام و ســـاکن[8] بـــووم
ئـــەز نـــە کـــورد بـــووم نـــە عـــەرەب بـــووم
ل مابـــەینـــا[9] هـــەردوویـــا بـــەرزەبـــووم
مـــام دنـــاڤ قـــەومـــێ غـــەریـــب

---

[1] ئەڤ هۆزانە ل ڕێکەڤتی (٢٠٠٤/٣/٩) ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[2] خودایێ من.

[3] بەردەوام، هەردەم.

[4] دامای، خەمگین.

[5] نوژدار.

[6] نوژدار.

[7] ل سالا (١٩٦٨)ێ، مەلا عیسا چوویە باژێڕێ مویسل و د ژیێ (٣٦)ێ ئەڤ هەلبەستە ڤەهاندیە.

[8] ئاکنجی، جیهوار.

[9] دناڤبەرا.

غەریب بووم دویر کەفتم ل جهێ خۆ
ب شك کەفتم ل سەر عەقیدا[1] خۆ
ئالۆز بووم ل سەر مەزهەبێ خۆ
مام دناڤ قەومێ غەریب

مەزهەبێ پیرا من هێلا
کەفتمە دویڤ عەقلێ جحێلا
وەکی دینا کەفتمە چۆلا
مام دناڤ قەومێ غەریب

ڕەبی تۆ دویمایێ[2] خێرکەی
سەفەرا مرنێ سەهل[3] کەی
جهێ من تۆ ل بەحەشتێ چێبکەی
مام دناڤ قەومێ غەریب

عیسا پیر بوو وی چ نەکر
پتر شێست سالا عومر بر
وەعظێت[4] وی تەئثیر[5] ل وی نەکر
مام دناڤ قەومێ غەریب

---

[1] باوەری.

[2] داوی، دیماهی.

[3] سانەهی.

[4] گۆتارێن.

[5] کارتێکرن.

# فەق سێنا[١]

---

[١] ئەڤ هۆزانە ل رێککەڤتی (٢٠٠٦/٥/١٥)ێ، ل باژێرێ مویسل هاتیە ڤەهاندن. زەلامەك ل گوندێ (باکرمان) سەر ب دەڤەرا زێباریانڤە ب ناڤێ (موحەمەد تاهر) هەبوو. کو سەرۆکێ قەبیلا (فەق سین) بوو، گەلەك حەز ژ مێهڤانان دکر و ب مەردی و دەستڤەکرێ ناڤدار بوو، هەر دیسان گەلەك حەز گشت خواندەکارێن ئایینی دکر ب تایبەتی یێن گوندێ (باکرمان)، (موحەمەد تاهر) باغەك هەبوو کو پڕی دارێن هەرمیك و سێڤ و تری بوو، ناڤبری خواندەکارێن ئایینی ژ چوونا ناڤ باغی ب مەرەما ژبەرکرنا وانەیێن خوە و خوارنا ڤیقیێ باغی، باغ کربوو د دەستێ فەقەهاندا. ئەڤ چەندە بۆ سالێن سیهان و چلان و پێنجیان و شێستان د سەدەیا بیستێ دا دزڤڕیت، (موحەمەد تاهر) ل سالێن شێستان د سەدەیا بێستێدا چوو بەر دلوڤانیا خودایێ مەزن، کورێ ئەوی (یونس) ل شوینا ئەوی ڕوینشت، ئەو ژی ل سالێن نوتان وەغەرکر، دوو کوڕ ل پشت خوە هێلان ئێك بناڤێ (موحەمەد ڕەئووف) ئاکنجیێ گوندێ (باکرمان)ە و یێ دیتر بناڤێ (عەبدولڕزاق) ل تاخا (شێخکا) ل مویسل ئاکنجیە. هەتا نوکە پەیوەندیێن ئەوان ل گەل حەزژێکەرێن زانستی بەردەوامە ب تایبەتی خواندەکارێن کو ل گوندێ (باکرمان) دخوینن. ڕۆژەکێ (عەبدولڕزاقی) نەڤیێ (موحەمەد تاهری) ئەوێ ل مویسل داخواز ژ مە کر سەردەانا برایێ ئەوی (موحەمەدی) ئەوێ ل (باکرمان) کو مەزنێ قەبیلا (فەق) سین)ە بکەین. داکو پەیوەندی د ناڤبەرا زانستخوازان و مالباتا (موحەمەد تاهری) بەردەوام بیت، ئەم وەك ئەندامێن ئێکەتیا زانایێن ئایینی یێن کوردستانێ ـ لقا مویسل کو پێکهاتیبوون ژ شێخ موحەمەد مێرسیدی سەرۆکێ ئێکەتیێ، مەلا ئیبراهیم ئاکرەیی، مەلا عەبدوللا سۆرانی، مەلا ئەکرەم گۆران، مەلا زاهر بانی، مەلا خالد چاربۆتی، مەلا ئیبراهیم گورگەڤەیی، مەلا عەبدولخالق عەلی بانی و ئەز مەلا عیسا مشەختی شەهی چووین گوندێ (باکرمان)، خەلکێ گوندی پێشەوازیەکا

ل هەیڤا چاریێ ت[1] بوهارێدا
مە زیارەتا فەق سێنادا
موختاری بەرخەك ل عەردیدا
گۆت ب خێرهاتن گەلی سەیدا

هنگۆ ئەم موشەرەف[2] کرین
گەلەك ئەم سەر بلند کرین
ل ناڤ مللەتی ئیختیار[3] کرین
ئەم ت[4] مەمنوونین حەتا دمرین

برای بۆ من هەدیەك[5] ئینا
نە ل ناڤ سوران نە ل بەهدینا
بەلکی ل ناڤ هەر سێ دینا
کەس هەدیەکا هۆ[6] نە ئینا

هەدیا وی هندەك مەلا بوون
ئەو مەلەکێت عەسمانا بوون
نە وەکی ئەهلێ عەردا بوون
ئەو خودان عەهد و وەفا بوون

---

گەرم ل مە کر و پشتی ئەز زڤڕیم من ئەڤ هەلبەستە ڤەهاند. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی))

(١) د.

(٢) سەربلند، سەرفەراز.

(٣) هەلبژارت.

(٤) ئەم د

(٥) دیاری.

(٦) هوسا.

وی خزمێت[١] خۆ خرڤەکرن
تەعریفا[٢] مەلا بۆ کرن
ئێک ئێکە وەصفا[٣] وا کرن
زۆر تازە[٤] وی بەیان کرن

ڤە دۆستێت باپیرێ مە بوون
هندەک فەقیێت گوندێ مە بوون
عەزیزێت میللەتێ مە بوون
ل ناڤ میللەتی زۆر ب نەفعە[٥] بوون

ئەڤە شێخێ بریفکایە[٦]
شێخێ باب و باپیرایە
بەطەلێ[٧] صلح و دەعوایە[٨]
شێخەکێ زۆر ب وەفایە

سەیداش[٩] موعەللمێ مە بوو
ب جحێلی زۆرێ ب کەشخەبوو
بۆ طالبا یێ ب نەفعە بوو
بەلێ پیچەک یێ ب قەبە بوو

---

(١) کەسوکار.

(٢) باسێ.

(٣) سالوخەت.

(٤) لاو، جوان.

(٥) ب مفا.

(٦) شێخ موحەمەد میرسیدی.

(٧) قەهرەمان.

(٨) ئاشتیێ و شەڕی.

(٩) ملا ئیبراهیم گورگاڤەیی زێباری. ل ساڵا (٢٠٢٠) مالئاڤایی کر.

ئەڤ مەلایە یێ گۆرانە[1]
چەندێ فەصیح و بەیانە
موفتییێ باژێڕ و گوندانە
ڕەکا وی یا ئاغانە[2]

ئەڤ مەلایەش[3] ئاکرەیە[4]
موثەقەفە[5] تێگەشتیە
ڕەکا وی زێبارییە
لەوا هندە یێ عەصەبیە

ئەڤ مەلایەش[6] یێ بانیە[7]
خەم هەلگرێ مللەتیە
موتەعەصبێ[8] شافعیە[9]
ب عەقیدێ زۆرێ صوفیە

ڤەکرێ مەلایێ لەکایە[10]
گولا سەرێ مە هەمیایە

---

(1) مەلا ئەکرەم گۆران.

(2) مەلا ئەکەرەم، دگەهشتە مالا (عاصم ئاغا)یێ دارەتێ.

(3) مەلایە ژ.

(4) مەلا ئیبراهیم ئاکرەیی.

(5) ڕەوشەنبیرە.

(6) مەلایە ژ.

(7) مەلا زاهر بانی زێباری.

(8) دەمارگیرێ.

(9) ئیمام موحەمەد کوڕێ ئدریسێ شافعی.

(10) مەلا عەبدولخالق عەلی بانی زیباری. لێ چونکە مەلا عەبدەلخالق ل گوندێ (لەکا) سەر ب هۆزا (هەرکیان)ڤە هاتیە سەر دونیایێ لەوڕا ناڤێ گوندێ ناڤبری هاتیە.

مـەشـهورە[1] ب وەعـظ[2] و خوطبايـە[3]
ئـــەصـــلـێ خـــۆ عـــەلـــی شـــێخایە

ئـــەڤـــە مـــەلایـــێ[4] چاربۆطيايـــە[5]
عاقلـــــدارێ مـــــە هـــــەميايـــــە
زدی[6] دەروێـــــــش و صـــــــوفيايە
ئـــەو دۆســـتێ لا مـــەذهـــەبيايـــە

ماموســـتا خـــەلكـــێ ســـوڕانە[7]
ئـــەو ســـەيـــدايێ مـــە هـــەميانـــە
طـــەريقـــا نـــەقشـــەبـــەنديانـــە[8]
گـــەلـــەكـــێ ب عـــيلم و ئيمانـــە

عيســـاش[9] فـــەقيـــێ گونـــدێ مـــە بـــوو
عـــــەزيـــــزێ بـــــاپێرێ مـــــە بـــــوو
ئـــەمينـــێ مـــەلايـــێ مـــە بـــوو[10]
بـــەلـــێ هنگـــی شـــاعێر نـــەبـــوو

---

(١) ناڤدارە، بەرنياسە.

(٢) گۆتار.

(٣) گۆتارا ڕۆژا ئەينيێ.

(٤) مەلا خالد چاربۆتی زێباری.

(٥) (چاربووت) گوندەكە سەر ب دەڤەرا زێباريانڤەيە.

(٦) دژی.

(٧) مەلا عەبدوڵلا گردە شێری سۆرانی.

(٨) ڕێبازا سەوفيگەريا نەقشەبەندی.

(٩) عيسا ژی.

(١٠) مەلا ئەكەرەم، مامۆستايێ ئەوان بوو. وی باوەريەكا موكوم ب (مەلا عيسا)ی هەلبەستڤانێ ئەڤ ديوانێی هەبوو.

عیسای چەند شێعرەك چێكرن
دلێت عالەمێ كول كرن
هندەك مەلا ل خۆ سل كرن
ئەو بیر ناكەن حەتا دمرن

## هەمیا پێکڤە مەسعوود ڤیا[١]

ل صەدێ صەد ل مە عیراقیا
دەنگێت خۆ دان ل دەشت وچیا
هەمیا پێکڤە مەسعوود[٢] ڤیا
ببیتە سەرۆك بۆ هەمیا

مام جەلالی[٣] ئەمر پێدا
تەوقیعا[٤] ئەوەل وی لێدا
پەرلەمانی ئیجماع[٥] پێدا
مەسعوود ڕەئیسە د ئەقلیمێدا[٦]

ل جیهانێ بیە کەیف و سەما
ژن و مێرا ئێك لێ نەما
نەکەت حەفلێ ل هەموو دەما
بۆ مەحبوویێ کوردا هەما[١]

---

[١] ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی ل (٢٠٠٥/٦/١٧)ێ، ل باژێرێ مویسل هاتیە ڤەهاندن.

[٢] مەسعوود مستەفا بارزانی، سەرکردە و ڕێبەرێ گەلێ کورد، ڕۆلەکێ باش د هەر دوو شۆرەشێن ئەیلول (١٩٦١-١٩٧٥)ێ، و گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ، دا هەبوو، د ناڤبەرا سالێن (٢٠٠٥-٢٠١٧)ێدا سەرۆکێ هەرێما کوردستانێ بوو، نوکە وەك مەرجەعێ سیاسیێ کوردان دهێتە هژمارتن.

[٣] جەلال تالەبانی.

[٤] ئیمزا، واژو.

[٥] کو دەنگی.

[٦] سەرۆکە د هەرێمێ دا.

ل دەولەتا چەند سەرۆك هاتن
بۆ پایتەختێ کوردا هاتن
فرۆکێت خۆ وان نیشاندن
ڕۆندکێن کەیفێ وان باراندن

حاضر بوون ت[۲] حەفلا سویندێدا
مەسعوود هات و د وێ گاڤێدا
دەستێ خۆ وی ل قورئانێدا
خائن نەبیت د جیهانێدا

برقی[۳] هاتن ل هەمی عەردا
بۆ ئەقلیمێ هەموو کوردا
ئەوە پڵنگ د ناڤ دەحلادا
ل جیهانێ هەمیێ دەنگڤەدا

کوڕێ مەلا مصطەفایە
تەئریخا[٤] وی یا ب بهایە
بەرەڤانێ مە کوردایە
بۆ مافێ مە یێ ب وەفایە

هێشتا عەمرێ وی حەفت ساڵ بوو
ژیان ل بەر وی زۆرا تاڵ[٥] بوو

---

(١) هەمیان.

(٢) د.

(٣) بڕویسك.

(٤) مێژوو، دیرۆك.

(٥) تەحلە.

چەندکێ ئەوی ڤە ل خیال بوو
کوردێ مسکین بێ مال بوو

کورد دا هەر مالی خڕڤە کەن
بەعثی دا وان بن[1] ئەنفال کەن
کوردێ مسکین دەربەدەر کەن
دا سەنەدێت[2] وان بەدەل کەن

جلکێت بەر کوردا لێ دستاندن
عەیالێ خۆ پێ د خەملاندن
عالمێت خۆ تێدگەهاندن
کورد دبێ ماڵن و بێ عەردن

موبارەك[3] بیت مەنصبێ تە[4]
هەر یێ بلند بیت سەرێ تە
یێ شکەستی بیت دوژمنێ تە
ل تە ڕازی بیتن ڕەبی تە

بۆ ڤێ شولێ تۆ لائیقی[5]
خودان تەجروبە[6] و سابقی[7]

---

(١) بەن.

(٢) بەلگەیێت.

(٣) پیروز.

(٤) پلە، پایە، پوست.

(٥) هەژی.

(٦) سەربوور.

(٧) دیرۆکی.

ت[1] گۆتنێــت خــودا تــۆ صــادقی
ل فــەصــاحەتــێ[2] تــۆ ناطــقی

مــن گــەلــەك ئــاخڤتن گــۆتن
ئاخاڤتنێـــت مـــن وەك بـــزۆتن
مێلاكێـــت دوژمنـــی ســـۆتن
نـــاڤێ مـــن ناهێتـــە گـــۆتن

ئـــەزم شـــاعێر كـــوڕێ گونـــدا
یـێ مـەشـهوور نیمـە[3] ل نـاڤ كـوردا
یـــێ حاضـــرم ل هـــەمـــوو عـــەردا
ئـــەزم یێـــت بێژنـــە مـــن ســـەیـــدا

(1) د.

(2) رەوانبێژیێ.

(3) نینم.

## ڤەكرنا بارەگایێ ئێكەتیا زانایێن ئاینی ل ئاكرێ[1]

هزار حەمد و هزار شوكر
بۆ خالقێ (حەی)[2] یێ نەمر
قەدرێ عولەما بلند كر
بوون وارثێت[3] ئەنبیانە[4]

د قورئانێ دا زكر كرن
دگەل مەلەكا[5] بەرانبەر كرن
ل دونیایێ سەر بلند كرن
حەتا دومایا[6] زەمانە

دامە دینێ سەعادەتێ[7]
بەرێ مە دابوو جەننەتێ
یێ خسار ئەوە ل ئۆمەتێ
نەبت تابعێ قورئانە

---

(١) ئەڤ هۆزانە ل رێككەڤتی (٢٠٠٥/٦/١٧) ل باژێرێ مویسل هاتیە ڤەهاندن. لێ هەژی گۆتنێیە كو بەری ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ ب چەندین سالان ئێكەتیا زانایان ل ئاكرێ هاتبوو دامەزراندن.

(٢) زیندی، ساخ.

(٣) ڕاسپاردە.

(٤) پێغەمبەران.

(٥) فرشتە، مەلائیكەت.

(٦) دووماهیا.

(٧) خوەشبەختی.

صەلات و سەلامێت بێ عەدەد[1]
ل نك خالق و ڕەبێ ئەحەد[2]
ل سەر ڕوحا نەبیێ مە ئەحمەد[3]
ڕەحمە بۆ جین و ئینسانە

ل پاش حەمدا ڕەبەلعالەمین
ئەم هاتین ل موصلا ڕەنگین
دا ل ڤێ حەفلێ حاضر بین
دگەل ڤا[4] سەیدا و عالمانە

ئەم هوشیار بووین دگەل بەیانێ
ئەم حاضر بووین ل كوردستانێ
دا بێنكەینە وێ ڕوحانێ
یا ل دەست مەچووی چەند سالانە

ڤەكرنا بنگەهێ عولەما د ئاكرێدا
زۆرا جوانە و یا ت[5] جهێ خۆدا
عالمێت وی عومدەنە[6] د هەرێمێدا
موحبێت[7] علم و فەقیانە

---

(١) بێ هژمار.

(٢) ئێكانە.

(٣) پێغەمبەرێ ئیسلامێ (س).

(٤) ئەڤان.

(٥) د.

(٦) پێشەنگ.

(٧) حەژێكەر.

وان چەند علمێ نەشر[١] کری
خزمەتا دینی یا کری
عالەم ژ خەوێ هوشیار کری
ڤەش[٢] فەضلا[٣] علمێ پیشانە

پاش سەیدایێ موحەمەد[٤] ل زانکوینێ دەرکەفتی
هەرێما ئاکرێ یا ب سەر کەفتی
علمێ ئایینی یێ ب ڕەوش کەفتی
ئەڤە مەعلووم و بەیانە[٥]

چەند جامع ل مەنطەقێ چێکرن
چەندێن یێت دیش[٦] وی تەعمیر[٧] کرن
چەند عالم لێ تەعین[٨] کرن
موعینێ[٩] وی بیت ڕەحمانە

مەعهەدا[١٠] ئاکرێ تەطویر[١١] کر

---

[١] بەلاڤ.

[٢] ئەڤە ژی.

[٣] قەنجی، باشی.

[٤] مەلا موحەمەد ئاکرەیی، پێشنڤێژ و گۆتارخوینێ مزگەڤتا مەزنا ئاکرێ.

[٥] ئاشکرا.

[٦] دیتر.

[٧] نویژەن.

[٨] دامەزراند.

[٩] هاریکارێ.

[١٠] پەیمانگەهـ.

[١١] پێشئێخست.

کەڤنە مەلا[1] تەدریس لێکر
عەقیدا نوی لێ بەرزکر[2]
دا لێ دەرکەڤیت شەیطانە

قوتابیێت ئایینی د ئاکرێدا
د سەر کەفتینە د کوردستانێدا
سەیدایێت وا[3] باش نیشێدا
فارسێت[4] نەحو و صەرفانە[5]

مە رێجا[6] هەیە ل بەرپرسا
ل بەر ڤی دینی دانن حەرەسا[7]
گوهـ نەدەنە ئەوان کەسا
گازی دکەن (حقوق الانسان)ە[8]

هەر کەسێ بکەت دگەل دینی خیانەتێ
وێ لێ غەزەب چیا رەبێ عیزەتێ
موحەمەد بۆ ناکەت شەفاعەتێ
چنکی گوهداری شەیطانە

---

[1] مەبەست مەلاێین ل سەر بیرۆباوەرییێن کەڤن دچن.

[2] ئاشکراکر، رۆنکر.

[3] ئەوان.

[4] زیرەك و شەهرەزا.

[5] نەحو و صەرفا عەرەبی.

[6] هیڤی.

[7] زێرەڤا.

[8] مافێ مرۆڤان.

هیڤیـــا مـــه ل ڕەبولعالـــەمـــین
پارێزیـــت كوردســـتانا ڕەنگـــین
ل خـــائین و شـــەیطـــانێ لـــەعـــین
ئـــەو حافـــظێ[1] مـــه هـــەمیانـــه

كوردســـتان جێگـــەی باپیرانـــه
جیگـــای عـــیلم و عالمانـــه
كـــەس نـــەبیـــت كـــوردێ نـــەزانـــه
یـــێ دویـــره ل دیـــن و قورئانـــه

عیســا بـــەســـه خـــۆ غافـــل كـــه
حـــەقییـــێ بێـــژه و عـــەمـــەل[2] پێبكـــه
بـــەســـه خـــۆ ل ئـــاخرەتـــێ ســـل كـــه
بگـــره ڕێكـــا صـــالحانه[3]

---

[1] پارێزڤانێ.

[2] كار.

[3] قەنجان، باشان.

## وەليما شێخى[1]

وەليمـــــا[2] شـــــێخێ مێرســـــيدا[3]
خاصصــه[4] ب مێــر خــاص و عــەگيــدا
هنـــدەك مـــەلاش[5] لـــێ حاضـــربوون
عيســـاى ســـجل كـــرن[6] د جيـــدا[7]

بيســت و حــەفــت ل هــەيفــا گــولانێ
ئـــەم دەركـــەفتـــين دگـــەل بـــەيـــانێ

---

[1] ئەڤ هۆزانە ل رێككەڤتى (٢٠٠٦/٥/٢٧)ێ، ل باژێرێ مويسل هاتيە ڤەهاندن. شێخ موحەمەد ميرسيدى سەرۆكێ ئێكەتيا زانايێن ئايينى يێن كوردستانێ- لقا مويسل، خوارنەك بەرهەڤكر و هژمارەكا زێدە يا كەسايەتيان داخوازكرن كو پێكهاتيبوون ژ: (ئەيوب تەيار رێكانى)، (حەجى عەزيز چاربۆتى)، (عوسمان بانى)، (شێخ موعتەصم بەرزنجى)، (مەلا ئيبراهيم ئاكرەيى)، (مەلا ئيبراهيم گورگاڤەيى)، (مەلا خالد چاربوتى)، (مەلا زاهرِ بانى)، (مەلا عەبدوڵلا سۆرانى)، (مەلا عەبدولخالق عەلى زێبارى)، (مەلا ئەكرەم گوران) و (مەلا عيسا مشەختى شەهى). ((ژ تيبينيێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ ديوانێ ب زمانێ عەرەبى)).

[2] دانا خوارنێ.

[3] شێخ موحەمەد ميرسيدى، سەرۆكێ ئێكەتيا زانايێن ئايينى يێن كوردستانێ ـ لقا مويسل.

[4] تايبەتە.

[5] مەلا ژى.

[6] تۆماركرن.

[7] د جهدا.

دا بێن[١] کەینە وێ ڕیحانێ
یا کو شین بووی ل کوردستانێ

شێخێ مە ئەم دەعوەت کرین
ل کوردستانێ حاضر کرین
ل فتنا تیرورا دویر کرین
ل ڕەحما خودێ نێزیک کرین

ماشائەڵڵا وێ دەعوەتێ
ل وێ چێکرنێ و بەرەکەتێ
ل وێ زێدەیێ ل وێ نیعمەتێ
خودێ هەر زێدەیێ بدەتێ

خێرا مەولیدا گەلەکە
هەر مۆدەکی[٢] تۆ ئێکی بکە
بەلا شاعێرا ل خۆ ڤەکە
خۆ نیزیکی خودێ خۆ بکە

نەبێژە مەولید بیدعەتە[٣]
پێ نازل نەبیە ئایەتە[٤]
پێ زێدە دبیت موحیبەتە
ب شەریعەت[٥] نیعمەلعادەتە[٦]

---

[١] بێهن.

[٢] ماوەکی، دەمەکی.

[٣] تشتەکێ نوی د ئایینیدا.

[٤] چ ئایەت پێ نە هاتینە خوار.

[٥] شەریعەتێ ئیسلامێ.

[٦] باشترین عادەتە.

گەلی برا ما چ بێژم
ل ئاحفتنێ یێ کەڕ و گێژم
نەشێم هوسا مالیش[1] بڕێژم
کوشتش[2] هۆ تازە برێژم

برا ئەز دەعوەتا ناکەم
ئەز خۆ شەرمەزار ناکەم
دێ ت[3] کول ملێ ئێکی ڕاکەم
ئەز دێ خۆ فێری چەپا کەم

موخلصێت من دوو[4] بانینە[5]
د سەربلندن د مێرکانینە
بۆ مالێ خۆ زۆر ت[6] سەخینە
ئەو وەکیلێت یێ شەهینە

مالێ شێخا بەرەکەتە
هەم شیفایە و هەم ڕەحمەتە
یا ڕەب تۆ بکەیە قیسمەتە
ل هەیڤێ جارەکێ عادەتە

یا ڕەبی تۆ هۆ ڕاگری
مە بپارێزی ل ئاگری

---

(1) مال ژی.

(2) کوشت ژی.

(3) د.

(4) مەبەست ژ دوویان (مەلا زاهر و مەلا عەبدولخاقە) کو خەلکێ گوندێ (بانی) نە.

(5) (بانی) گوندەکێ سەر ب دەڤەرا زێباریانڤەیە.

(6) د.

ل فتنـــا شــــەيطــــان و كـــافرى
ئيمــــانێ ل مـــــە وەر نــــە گـــرى

شـــێخێ وەليـــانى[١] تـــەئخيـــر بـــوو
جـــەماعـــەت زۆر پـــێ تـــەئثيـــر[٢] بـــوو
عيســا گـــەلـــەك طـــەغـــەويـــر[٣] بـــوو
پاشـــى ئـــەڤـــە يـــا ب تـــەكبيـــر بـــوو

تـــەئخيـــرا[٤] وى خێـــر تێـــدا بـــوو
بـــەر صـــولحا دوو فيئـــەتـــا[٥] بـــوو
ئـــــەڤــــە رێكـــا بـــابێ وا بـــوو
ل زرپـــەتـــێ[٦] حـــەتـــا حـــەتـــا بـــوو

عيســاى چـــەنـــد شـــيعرەك چێكـــرن
دوژمـــن بـــۆ خـــۆ پـــەيـــدا كـــرن
گونـــەحێـــت[٧] خـــۆ زێـــدەكـــرن
ئـــەوى ل خـــۆ دويـــر ئيخســـت مـــرن

هـــــزار صــــەلات و هــــەم ســــەلام
بـــۆ ڕوحـــا نـــەبيـــێ خـــاص و عـــام
موحـــــەمــــــەدێ شــــرين كـــــەلام
ئـــــەوێ بـــــەلاڤكـــــرى ئيســـــلام

---

[١] شێخ موعتەصم وەليانى.
[٢] كارتێكرن.
[٣] ئالۆز.
[٤] گيربوون.
[٥] دەستەك.
[٦] دويندەهـ.
[٧] گونەهێت.

## حەجی سەعدوڵلای هزرا خۆ کر[1]

حەجی سەعدوڵلای[2] هزرا خۆ کر
وی گۆت من بەس مال خرڤەکر
من چ جا کەس مێڤان نەکر
لەوا ئەز مام یێ بێ هۆگر

لێرە و وێڤە دێ خێرا کەم
ئەوەلی دێ بدەست مەلا کەم
پاشی گەڕا فەقیرا کەم
قەبرێ خۆ ب باشی ئاڤاکەم

مەلا یێت میسل گەلەك ت[3] فەرن
چنکی کەڤنە برادەرن
بۆ من د باشن و ت[4] بێ سەرن
کوردێت باشن ت[5] بێ ضەڕەڕن

---

[1] ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٦/١١)ێ، ل بازێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن. هەژی گۆتنێیە ئەڤ هەلبەستە ل دەمێ سەرەدانا مە بۆ دەڤ حەجی سەعەوڵلا حجی موحەمەد ل بەردەڕەش کو ل سەر داخوزا ئەوی هاتە بەرهەڤکرن. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی)).

[2] حەجی سەعەوڵلا حجی مەحەمەد ئاکنجیی بەردەڕەش.

[3] د.

[4] د.

[5] د.

بـەلـێ شـێخێ وا یێـب زەحمـەتـە[١]
زۆرێ ب قـــەدرە و یێــب قیمـــەتـــە
حاضــر نابیــت ل ســەر دەعــوەتــە
ئـــیللا ببینیــــت دەرفـــەتــــە

چـەنـد جـارا مـن طـەڵـب[٢] کـرن
هیڤـــی و ڕێجـــا مـــن لـێ کـــرن
ڕێجایـــا مـــن ڕەفـــض[٣] کـــرن
خـــەمێــت مـــن وا زێــدە کـــرن

پاشـــی شـــێخی هـــزرا خـــۆ کـــر
گۆتنـــا ڕەســولی تـەطبیـق[٤] کـــر
ئیستشـــارە[٥] ب ئـــەنـــداما کـــر
ڕۆژەك بـــۆ مـــن موعـــەییـەن[٦] کـــر

هـــاتن ئـــەم مشـــەڕەف[٧] کـــرین
گـەلـەك ئـەم سـەر بلـنـد کـرین
ل نـــاڤ مللـــەتــی عــەزیـز کـرین
ئـەم ت[٨] مـەمنونین حـەتـا ت[١] مـرین

---

(١) شێخ موحەمەد میرسیدی.

(٢) داخواز.

(٣) ڕەڤز، ڕەت.

(٤) بجههینا.

(٥) ڕاوێژکاری.

(٦) دەستنیشانکر.

(٧) سەرفەراز.

(٨) د.

كەیفا من ب كەڤنە مەلا یا تێت
ب عەقیدا شێخ و صوفیا تێت
ب دەنگێ زكر و تەسبیحاتا تێت
ب ڕەوشا باب و باپیرا تێت

ئەز زەنگینا میڤان ناكەم
مرۆڤێت مەزن دەعوەت ناكەم
ئەز دێ خۆ فێری خێرا كەم
دێ تێكەلیا فەقیرا كەم

ئەگەر یێ زەنگین مەلا بیت
قەینا[٢] كەت بلا مێڤان بیت
چنكی ڕزق پێ زێدە ت[٣] بیت
ڕزق ب مەلایا قەد كێم نابیت

كەڤنە مەلا بەرەكەتن
خودان ویردن[٤] ب مەنفیعەتن[٥]
گەلەك بڕەحم و شەفەقەتن[٦]
خودان دوعا و هیمەتن

---

(١) د.
(٢) چ نینە.
(٣) د.
(٤) تەسبیحات.
(٥) ب مفا.
(٦) دلۆڤانی.

بەسە ئەز مالی خڕڤە کەم
بۆ وارثا قەصرا چێبکەم
عەذابا خۆ هەر زێدەکەم
چ جا چ خێرا پێ نەکەم

من بۆ دای بابا چ کریە
حەجەك بۆ ئێکی من کریە
یان مزگەڤتەك ئاڤا کریە
یان خێرەك بۆ ئێکی کریە

وارث دێ زوی کەن و لەز کەن
حەففارەکێ دێ پەیدا کەن
دا مەیتی[1] خۆ زوی بن ئاخ کەن
تەسلیمێ مشك و مارا کەن

پاشی دێ خیڤەتێ ئینن
دوو سێ ڕۆژا دێ بن ڕوینن
پاشی دێ قاضیەکێ ئینن
ب عەدالەت مالێ خەملینن

وارثا مالێ خۆ لێکڤەکر
مریێ خۆ لبن ئاخێ بیر کر
مەلەك[2] هاتن لێ سووئال کر
ڤە[3] مالە تە ل کێرێ خڕ کر

---

[1] مری.

[2] فرشتە، مەلائیکەت.

[3] ئەڤ.

عیسای بیرا قەبری ناهێ
ئەوێ مەشغولە[1] ب دونیایێ
ل حالێ خۆ ناکەت ڕایێ
دونیا پیچە ب کێر کەس ناهێ

(١) مژویل.

## پێشمەرگەمە[1]

پێشـــمەرگـــەمـــە ئـــەز خـــۆش مێـــرم
ل نـــاڤ شـــەڕی خـــۆ ڤـــە ناشـــێرم
ئـــەز پڵـــنگم بـــەچکـــە شـــێرم
دێ یـــێ هـــوبم حـــەتـــا دمـــرم

بـــەرەڤـــانێ مـــافێ خۆمـــە
کوڤـــان داری عـــەردێ خۆمـــە
ئـــەز شـــڤانێ پـــەزێ خۆمـــە
حـــەتـــا ت[2] مـــرم[3] هـــەر یـــێ هۆمـــە

ئـــەز یـــێ هومـــە دێ یـــێ هـــۆ بـــم
حـــەرەســـێ مللـــەتـــێ خـــۆبم
بـــەرەڤـــانێ خاکـــا خـــۆ بـــم
حـــەتـــا ت[4] مـــرم دێ یـــێ هـــۆ بـــم

دێ یـــێ هـــوبم غـــەششـــێ ناکـــەم
وەلاتـــێ خـــۆ دێ ئاڤـــا کـــەم
ئـــەز دێ شـــەڕێ دوژمنـــا کـــەم
حـــەتـــا ت[1] مـــرم هـــەر دێ هـــۆ کـــەم

---

(١) ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی (٢٢/٥/٢٠٠٦) ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) د.

(٣) دمرم.

(٤) د.

سویندا مە ب ئاخا کوردایە
عەهدێ مێرا یێ وەصایە[٢]
هندی پێشمەرگەك ل مە مایە
دێ یێ هۆ بیت حەتا مایە

سویندا مە ب خۆینا شەهیدا
ناهێلم تولا وان کوردا
ئەوێت کەفتیە ت[٣] بن ئاخێدا
ت[٤] وەختێ ظولم[٥] و ئەنفالێدا

نەحەقیێ قەد قەبوول ناکەم
کەیفا دوژمنی خۆش ناکەم
دێ دونیایێ ل وان خڕاب کەم
ب دەستێ خۆ دێ وان بن ئاخ کەم

ئەز مێرەکێ ب سەد مێرامە
بۆ ئاخا خۆ یێ ب وەفامە
نە شریکێ[٦] دوژمنامە
ژەهرا مارێ بێ وەفامە

---

[١] د.

[٢] وەسایە.

[٣] د.

[٤] د.

[٥] ستەم.

[٦] هەڤپشك.

ب هزارا کورد ب کیمیای مرن
ل گوندێت وان ئاڤ هشك كرن
خانی ب طۆپا خراب كرن
وا هزر كر قەد نامرن

ڕێکا بارزانی هەلگرم
دێ خەبتم حەتا ت[1] مرم
بۆ دوژمنی ئەز ئاگرم
مننەتا کەسی هەلناگرم

ڕێبازا پارتی[2] بەر نادەم
خۆ ل ناڤ چاڤێت دوژمنا دەم
ئەز ئێکم خۆ ب صەدا نادەم
دێ دوژمنی وێڤە پالدەم

بابێ کورەکێ نازدارم
ل ناڤ مللەتی نەیێ دیارم
بەلێ ل بنڤە خەباتکارم
بۆ وەطەنی یێ هوشیارم

---

(1) د.

(2) پارتی دیموکراتی کوردستان- عیراق، ل سالا (١٩٤٦)ێ، هاتیە دامەزراندن.

## خێرا چێکرنا مزگەڤتا[1]

بناڤێ خودێ یێ دلۆڤان
ئەڤە جامعە هاتە دانان
ل سەر نەفەقێ[2] خودان خێران
صەلەوات ل سەر نەبیێ ئینس و جان

ئەڤ جامعە یا ئاڤا کری
بناڤێ فلانی نااڤ کری
شەیطان ل مەنطەقێ[3] دویر کری
ل بەر دەنگێ قورئان و زکری

چێکرنا جامعێ علامەتێ ئیمانێیە
هەم عەلامەتێ ترسیانا ژ خودێیە
هەم ئیقتدایا[4] ب نەبیێ ئوممەتێیە
هەم گوهێ خودانا ئەمرێ قورئانێیە

ئەڤ جامعە هاتە چێکرن ب تەرتیب و ئەساس[5]
هاتە تەخطیط[6] کرن ب هەندەسە[1] و قیاس[2]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٩/١) ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[2] مەزاختن.

[3] دەڤەر.

[4] پەیڕەویا.

[5] ب ڕێکخستن و ب بنیات.

[6] نەخشە.

پـاره لـێ هاتنـه صـەرف كـرن ب حـوب و ئـيخلاس[٣]
دا لـــــێ ڕازی بيـــــت ڕەبولنـــــاس[٤]

ئـەمـر ت[٥] كـەت نـەبيـێ پـەيدا بـووی ل مـەككـێ
هـــەر كـــەســێ ئاڤــا بكـــەتــن جامعـــەكـــێ
وەلـــەو هنـــدی[٦] جـــێ كـــەتيـــەكـــێ[٧]
خـــودێ دێ ل بحـــەشـــتێ دەتـــێ قـــەصـــرەكـــێ

ل بـــــەر ڤـــــێ خێـــــرا هنـــــدا مـــــەزن
پێغـــەمبـــەری لوبنـــە[٨] و بـــەر نـــەقـــل ت[٩] كـــرن
وەختـــی مزگـــەڤـــت ل مـــەدينـــێ هاتيـــە چێكـــرن
دا ل ڤـــێ خێـــری نـــەهێتـــە مـــەحـــروم[١٠] كـــرن

هـــەر كـــەســێ جامعـــەكـــێ بـــدەتـــە چێكـــرن
هنـــــدی عيبـــــادەت تێـــــدا بێتـــــە كـــــرن
ئـــەو شـــريكێ هـــەميايـــە ل ڤـــێ خێـــرا مـــەزن
خێـــــرا واش[١] نـــــا هێتـــــە كـــێم كـــــرن

---

[١] ئەندازياری.

[٢] پيڤان.

[٣] ب حەژێكرن و ب دلەكێ پاقژ.

[٤] خودايێ مرۆڤان.

[٥] د.

[٦] تەمەت.

[٧] هێلينا باڵندەيان، واتە هەر چەند بچويك ژی بيت.

[٨] تابوك.

[٩] د.

[١٠] بێ باهر.

چێكرنا جامعا ئێكە ژ وان خێرا
كو ناهێتە قەطع[٢] كرن ل پاش مرنێ را
چنكی صدەقا جارییە[٣] ئێكە ل وان خێرا
كو دێ شول كەت بۆ خودانێ خودان ت[٤] بن ئاخێرا

چێكرنا جامعا زۆرا ب فایدەیە
مالینا مزگەڤتا مارەیا حوریایە
نڤێژەك تێدا ب جماعەت بیست و حەفتایە
ئەڤە گۆتنا موحەمەد و ل موصطەفایە

برا نەبەی ل هزر و بیرا
بخۆی پیڤاز یان سیرا
ل صەفی ڕاستێ وەكی تیرا
نەكە بكەڤیە زەمهەریرا[٥]

ئەمر ت[٦] كەت نەبیێ ئوممەتێ
هەر كەسێ بخۆت سیر و پیڤاز و قوڕاتێ
بلا ئەو نەهێتە مزگەڤتێ
عالەم دێ ل وی كەت نەفرەتێ

صەفا[١] پێشیێ قورتال نەكە

---

(١) ئەوان.

(٢) قەت، بڕین.

(٣) بەردەوامە.

(٤) د.

(٥) سڕ و سەقەم.

(٦) فەرمان.

ڕەخێ ڕاستێ ل دەست خۆ نەبە
ل ڕەکعەتا ئەوول حاضر بە
ل قییامەتێ خودان خێر و سەر بلند بە

هیڤیا مە ل ڕەبێ عیزەتێ
مە کەیفخۆش بکەتن ب جەنەتێ
ببینە ئەهلێ سەعادەتێ[٢]
مە دەربێخێت ل ڤێ میحنەتێ[٣]

یێ بیە سەبەبێ ڤێ مزگەڤتێ
خودێ جێ[٤] وی خۆش کەتن ل بەحەشتێ
ل سەر دونیا یێش مالی بدەتێ
بیتە ئەهلێ سەعاسەدەتێ

بۆ وی یێ شوول تێدا کری
ب غەفرینیت و دویر کەت ل ئاگرێ
دگەل یێت پشکداری کری
د ڤێ حەفلێ[٥] دا حضوور[٦] کری

---

(١) ڕێز.

(٢) خوەشبەختی.

(٣) تەنگاڤیێ.

(٤) جهێ.

(٥) ئاهەنگ.

(٦) ئامادەبوون.

# خۆ حاضرکە بۆ مرنێ[1]

برا ڕابە تۆ خۆ کارکە
خۆ حاضر کە بۆ مرنێ
شەڤ و ڕۆژا تۆ ب خەبتە[2]
بۆ خۆ خۆشکە قەبرێ ب بتێ

قەبرێ ب بتێ موصیبەتە
چەندێ ب ترسە و یێ ب هەیبەتە
یان ئاگرە یان جەننەتە
تۆ ل من بزانە ڤێ گۆتنێ

ئەڤ گۆتنە یا ب حسێبە[3]
یا ب حەدیث[4] و یا ب کتێبە[5]
تۆ چاڤەرێ ڤێ قەسێبە
تۆ دێ بینی ل پاش مرنێ

وەختێ هاتنە تە دوو مەلەك
بێت دەستا دا گورز و خەلەك
خۆ نە ترسینە زۆر گەلەك
یێ فەصیح[1] بە ل ئاخفتنێ

---

[1] ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٨/٢٢) ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[2] کار بکە.

[3] ب هژمارە.

[4] فەرموودە.

[5] (کتێب) واتە (قورئان).

دێ هێنە تە د ناڤ قەبریدا
نەکیر و مونکەر[2] د گاڤێدا
دێ ل تە پرسن د عەقیدێدا
نەچی بێژی وەی ل منێ

هەوار خودێ ما من چکر
خۆلیا گوندا ب سەرێ خۆ کر
قەبرێ خۆ من پڕ ئاگر کر
شەڤ و ڕۆژا تێم سوتنێ

کانێ کوڕ و برایێت من
عەشیرەت و پسمامێت من
ئەو بۆ ناهێن ل هەوارێت من
وان ئەز هێلام ڤێرە ب تنێ

وا ئەز هێلام و وان لەزکر
خیڤەت ڤەدا و تازی ڕاکر
دەعوا مالێ میراتەی کر
ملک هاتە فرۆتنێ

ئەو ملکێ من خڕڤە کری
چ جا چ خێر پێنە کری
قەصرا غەریبی پێ چێکری
فایدە نەدا ل پاش مرنێ

---

(١) ڕەوانبێژ.

(٢) ئەو هەر دوو فریشتەنە ئەوێن پرسیارا (خودێ، پێغەمبەری و دینی) ژ مری دکەن.

گـــەلـــی بـــرا خـــۆ هوشـــیار کـــەن
گوهـــدارێ نـــەبیـــێ موختـــار[1] کـــەن
رێکـــا دینـــێ ئیختیـــار[2] کـــەن
گوهـــ نـــەدەنـــە مـــال و ژنـــێ

گـــەنمـــێ زەر بـــووی رپنـــێ ناکـــەت
دارا هشـــك بـــەلگـــا نـــادەت
دختـــور پیـــرا جحێـــل ناکـــەت
خـــۆ حاضـــر کـــەن بـــۆ مرنـــێ

عیســا پیــر بــوو تــەوبــە نــەکــر
خــۆ ل گونــەهــا پــاقژ نــەکــر
ئــەوی شــەیطــان ل خــۆ دویــر نــەکــر
حاضـــر نـــەبـــوو بـــۆ مرنـــێ

---

[1] هەلبژارتی.

[2] هەلبژێرن.

## گازیەك بۆ داعشا[1]

ئەی داعشێ پیسێ چەپەل[2]
تە نینەچ مال و مەزەل
هندی هەبیت کوردێ بەطەل[3]
هەرە بارکە پیسێ زەغەل[4]

ئەز مێرخاصم[5] پێشمەرگەمە
ئیزرائیلێ ڕحا تەمە
دێ تە کوژم هندی هەمە
هەرە بارکە پیسێ زەغەل

پێشمەرگە زۆری ب قووەتە
د شەڕا زۆرێ ب شددەتە[6]
ل سەر داعشا یێت هەیبەتە
هەرە بارکە پیسێ زەغەل

ئەمن[7] نەڤیێت صەلاحەددین
بزانە ئەم چ جا ئەم نا ڕەڤین

---

(1) ئەڤ هۆزانە ل ڕێککەڤتی (٢٠١٤/١٢/٢٩)ێ، ل باژێڕێ هاتیە ڤەهاندن.

(2) پیس.

(3) قەهرەمان.

(4) زێدە پیس.

(5) مێرخواسم.

(6) دژوار.

(7) ئەمین.

هەڕە نەخۆ دێ تە گرین
هەڕە بارکە پیسێ زەغەل

ئەم کوردین خودان ئیمانین
مننەتا کەس ئەم نزانین
بۆ خاکا خۆ بەڕەڤانین
هەڕە بارکە پیسێ زەغەل

بەسە جامعا ب هەڕفینە
بێژە خەلکی ئەڤە دینە
بترسە ل رەببولعالەمینە
هەڕە بارکە پیسێ زەغەل

چەند مەزار تە خڕاب کرن
چەند عائلە[1] ڤەدەر کرن
گەلەك ل ترس و سەڕما مرن
هەڕە بارکە پیسێ زەغەل

ئەڤە یەرێکا دینێ تە
یان سننەتا[2] حەبیبێ تە
یان ڕەوشت و ئەخلاقێ تە
هەڕە بارکە پیسێ زەغەل

ئەمن[3] پێشمەرگێن بارزانی
بۆ تە دبێژین دا بزانی
بەسە خۆ تۆ نە حەیوانی
هەڕە بارکە پیسێ زەغەل

---

(١) خێزان.

(٢) سونەت، ڕێك، ڕێباز.

(٣) ئەمین.

